# سێ
# باڵەکەی
# بزوتنەوەی هەقە

- مامەڕەزایی- کەڵکە سماق
- حەمەسوریی- کلاّوقوت
- حەماغایی - پشدەر

ئامادەکردنی

مەلا سمایلی نورەدینی

# تێڕوانین لە بزووتنەوەی هەقە

**سـی . جـی . ئـەدمـۆنـدز:**

**لەناو هەقەکاندا جۆرێك لەکۆمۆنیستی ماڵ و موڵك و ئافرەتی تێدا بەدی دەکرێت( کورد**،پەرتوکی(کورد، تورك و عەرەب)- ل١٨٧)

**مـحـمـدی مـەلا کـەریـم:**

**دەتوانرێ بوترێ هەقە ڕێکخراوێکی سۆشیالیستی خەیاڵی بوو لەکۆمەڵگەیەکی کشتوکاڵیدا بێ بەرنامەو پرۆگرامێکی دیاری کراو** .

(پەڕتوکی (ئاوڕدانەوەیەك لە بزوتنەوەی هەقە- مستەفا عەسکەری)، ل٥١، پەڕاوێزی ٥٨.

**هـەژار مـوکـریـانـی:**

**بەرلەوەی بچمە عیراق ( حەمەسور ) ناوێك لەو تایەفەدا داوای جۆرێك سۆشیالیستی دەکرد، کە لەبیرو بڕوای مەزدەکی نزیك بوو.** (پەڕتووکی چێشتی مجێور، ل٥٠٥)

**هـاوڕێ بـاخـەوان:**

**ترسناکترینی هەموو ئەو بزووتنەوە ئایینیانەیە کە لەکوردستاندا ڕووی داوە چونکە بەشێوەیەکی ڕەها چەند بنەمایەکی ئایینی ئیسلامیان داوەتە دواوەو لەجێیدا چەند پرەنسیپێکی ( سۆشیالیستانەیان ) دانابوو کەزۆربەی خەڵکی ناوچەکە باوەڕیان پێی هێنابوو و نازنێوی ( هەقە ) یان وەرگرتبوو لەجیاتی ( مسوڵمان )**

پەرتوکی ئالآی کورد ل(٦٦)

**دکتۆر ڕەشـاد مـیران:**

**وا دەردەکەوێ کە شێخ عبدالکریم و پەیڕەوکەرانی هەرچەندە کۆمەڵەیەکی ئایینیان پێکهێنابوو، زێتر مەتریالیست و ریالیست بوون لەوەی ئیدیالیست بن.**

پەرتووکی(ڕەوشی ئایینی و نەتەوەیی لەکوردستان) ل(٦٣)

**محمد علی سوڵتانی:**

**بەدەست پێکردنی خەلیفایەتی شێخ عبدالکریمی شەدەڵە بزافی حەقە، کە گەڕانەوەیەك بوو لە نەقشبەندییەوە بۆ ڕێورەسمی ( عەلەوییە توندڕەوەکان – ئەهلی حەقە – ئالی حەق ) لە سنوری ئیرشادی شێخ عبدالکریم دا.**

(پەرتوکی ڕاپەڕینی عەلەویەکانی زاگرۆس، یان لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی لەسەر ئەهلی هەق) ل٢٣٨

**مەلا سمایل نورەدینی:**

**ئەوەی کە لە نێوباڵی ( حەمە سور )یدا پەیڕەو کرابوو، سۆشیالیزمێکی واقیعی خێزانی بووە.**

## پێشەکی:

ساڵی (٢٠٠٩) و ژمارە (٥٠)ی (گۆڤاری شمشارە)مان لە (ڕانیە) تەرخانکرد بۆ بەدواداچوونی هەرسێ باڵەکەی (بزوتنەوەی هەقە)، کە لەدوای کۆچی دوایی کردنی دامەزرێنەری بزوتنەوەکە سەریان هەڵدا.

(بزوتنەوەی هەقە)ش لە ساڵەکانی بیستەکانی سەدەی ڕابردوو لەسەر دەستی (شێخ عبدولکەریمی شەدەڵە) و لە هەناوی (تەریقەتی نەقشبەندی) هاتەکایەوە.

دوای کۆچی دوایکردنی ناوبراویش بزوتنەوەکە دەبێت بە سێ باڵ:

١- باڵی (مامەڕەزایی - کەڵکەسماق-ی دوکان)، کە برای (شێخ عەبدولکەریمی شەدەڵە) بووە.

٢- باڵی (حەمەسووری کڵاوقووت-ی چەمچەماڵ)

٣- باڵی (حەماغای هەنارۆکی پشدەر)

دیارە بەر لە ئێمە پەڕتوکی (ئاوڕدانەوەیەك لە بزوتنەوەی هەقە)، لەلایەن (مستەفا عەسکەری) و پەڕتوکی (بۆ لە هەقە کەوتنە تەقە) لەلایەن (زوهێر محەمەد زوهدی) و چەند بابەتێك لە گۆڤارەکان بڵاوکرابۆوە، پێش هەموو ئەوانەش (سی جی ئیدمۆندس-ی حاکمی سیاسی بەریتانیا لە عێراق) لە ساڵەکانی بیستەکانی سەدەی ڕابردوو شتگەلێکی سەبارەت بە هەقەکان نوسیوە، هەروەها (هەژار موکریان)-یش لە پەرتوکی (چێشتی مجێور)دا باسی لە هەقەکان کردووە.

ئێمەش لەلای خۆمانەوە هەستاوین بە بەدوادچوونی زیاتر بۆ سێ باڵەکەی هەقە و لەنێویشی دا:

- تاکو ئێستاکە وا زانراوە کە کۆچی دوایی کردنەکەی (شێخ عەبدولکەریمی شەدەڵە) بەهۆی زەبری بەردێك بووە کە لە پێی دراوە، بەڵام ئێمە لە زمانی (کاك محەمەد عەلی مەلا سەفی) کە ئەویش لە زمانی کۆچکردوو (سۆفی عەلیە شەلی سۆفیان)ی مەرگە- پزیشکە میلیەیە تایبەتیەکەی (شێخ عەبدولکەریم) بیستویەتی کەوا برینی پێیەکەی شێخ عەبدولکەریم بەهۆی بەرکەوتنی گوللەی تفەنگەوە بووە.
- چاوپێککەوتنە ڤیدیۆییەکەی (حەمە سووری کڵاوقوت و حەسەن جوبڵاغی) لە ساڵی (١٩٨٥) کە لەلایەن بەڕێز مامۆستا (عەباس عەبدولڕەزاق-پێشمەرگەی شاخی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان) ئەنجامدراوە.
- سەبارەت بە باڵەکەی (حەماغای پشدەر) بەر لە ئێمە هیچ زانیاریەکی نوسراوی لەبارەیەوە نەبوو، کە پەیڕەوەکانیشی پێیان گوتووە (مەهدی)یە.
- سەبارەت بە (مامەڕەزای کەلکەسماق)یش، خودی مامەڕەزا لەگەڵ هەڵگیرساندنی بزوتنەوەی چەکداری کورد (شۆڕش)دا نەبووە، هەروەك کە لە دژیشی نەبووە.
- بەڕێز (محەمەدی مەلاکەریم) لە پێناسەکردنی بزوتنەوەی هەقەدا گوتوویەتی: بزوتنەوەیەکی سۆشیالیستی خەیاڵی بوو لە کۆمەڵگەیەکی کشتوکاڵیدا. کە بەڕای ئێمە ئەوەی کە لە نێو باڵی (حەمەسور)یدا پەیڕەو کراوە، سۆشیالیزمێکی واقیعی خێزانی بووە.

دواجاریش لە ئێستادا سەبارەت بە سێ باڵەکەی بزوتنەوەی هەقە دیارە بەڕێز (شێخ هاوڕێ کاکە حەمە مامەڕەزا) کە لە ژیاندایە و لە گوندی (کەڵکەسماق)ی (دوکان) نیشتەجێیە خاوەن تەکیەیە، پاشماوەی باڵی مامەڕەزایە، پابەندیشە بە نوێژ و ڕۆژوو.

سەبارەت بە باڵەکەی (حەمەسوری کڵاوقوت)یش ساڵی (٢٠٠٩) کە ئێمە هەستاین بەم بەدواداچوونەدا سێ ئافرەتیان لەژیاندا بوو کە لە ئێستادا تەنیا (تاتە حەلاو) لەوباڵە لە ژیاندا ماوە و هیچ منداڵێکیشی نیە.

سەبارەت بە باڵەکەی (حەماغای پشدەر)یش دیارە هیچ پاشماوەیەکیان لە ژیاندا نەماوە.

**مەلاسمایلی نورەدینی پایزی ٢٠١٨- ڕانیە**

# بەشی یەکەم

١- بزووتنەوەی هەقە چی بووە؟

٢- بزووتنەوەی هەقە لەچییەوە سەری هەڵدا؟

٣- تەریقەتی نەقشبەندی و وشەی نەقشبەند لەچییەوە هاتووە؟

٤- ڕیشەی تەریقەتی نەقشبەندی.

٥- جیاوازی نێوان تەریقەتی قادری و نەقشبەندی.

٦-ئەوکەسانەی تەریقەتی نەقشبەندیان دامەزراندووە هیچیان عەرەب نەبوون.

٧- چۆنیەتی گەیشتنە لای خوا لای نەقشبەندیەکان.

٨- تەریقەتی نەقشبەندی لەکوردستان.

٩- لقەکانی تەریقەتی نەقشبەندی لەکوردستان.

# بـزووتــنـەوەی هـەقــە چــی بــووە ؟

**(محمدی مەلا کەریم) لەپێشەکی چاپی یەکەمی (ئاوڕدانەوەیەك لەبزووتنەوەی هەقە / مستەفا عەسکەری) ساڵی ١٩٨٢ لە لاپەڕە (٤)دا نوسیویەتی:** یەکێ لەڕووداوە بایەخدارەکانی ئەم سەدەیەی کوردستانی خواروو بەرپابوونی (بزوتنەوەی هەقە) یە کەبزووتنەوەیەکی (ئایینی — کۆمەلأیەتی) بەڕاستی مەزن بوو .

**(هاوڕێ باخەوان)یش لەپەرتوکی (ئالأی کورد) سەبارەت بە سەرهەڵدانی (بزووتنەوە هەقە) لەلاپەڕە (٦٦ — ٦٩) دا دەڵێ:** (لێرەدا جێی خۆیەتی کە پەنجە بۆ بزووتنەوەیەکی تری ئایینی ڕابکێشین کە بەمەبەستی خۆماڵی کردن و گۆڕینی ئایینی ئیسلام لەکوردستاندا هاتەدی، کە ئەویش (بزووتنەوەی هەقە) بوو، کە لەسیەکانی ئەم سەدەیەدا لەناوچەکانی (سورداش — باشوری کوردستان) دا سەری هەڵداو ترسناکترینی هەموو ئەو بزووتنەوە ئایینیانەیە کە لەکوردستاندا ڕووی داوە چونکە بەشێوەیەکی ڕەها چەند بنەمایەکی ئایینی ئیسلامیان داوەتە دواوەو لەجێیدا چەند پرەنسیپێکی (سۆشیالیستانەیان) دانابوو کەزۆربەی خەڵکی ناوچەکە باوەڕیان پێی هێنابوو و نازنێوی (هەقە) یان وەرگرتبوو لەجیاتی (مسوڵمان) کە (شێخ عبدالرکریمی شەدەڵە) و (مامە ڕەزای کەلکە سماقی) دیارترینی ڕابەرەکانیان بوون و خاوەنی زۆر بیری پێشکەوتوو خوازانە بوون. لەنێو هەقەکاندا هەموو جۆرە توێژو چینێك دەبینراو بەئاغاو جوتیارو هەژارو دەوڵەمەندەوە کە ئەوە دەگەیەنێت زۆربەی کۆتە کۆمەلأیەتیەکانیان لەنێو خۆیاندا نەهێشتبوو، بزووتنەوەی هەقە زۆر درەنگ لەکوردستاندا ڕوویدا چونکە لەم سەدەیەدا بزوتنەوەیەکی چاکسازی ئایینی کارێکی نەگونجاوەو قۆناغەکەی بەسەر چووەو نابێـتەهۆی هێنانەکایەی ئایدۆلۆژیایەکی بەهێزی فەلسەفی و بزووتنەوەیەکی کوردایەتیش هاوکات لەگەڵ بزووتنەوەی هەقەدا لەگەشەکردندا بوو بنچینەی جەماوەری کوردستان زۆرتر دایدەشکاند بەلای کوردایەتیدا نەك هەقەو پاشان ئەم بزووتنەوەیە زۆر تەمەن درێژیش نەبوو. چونکە هەر زوو بەزوو داگیرکەری عیراقی بەبیانووی بێ ئایینی و بەهانەی ترەوە کەوتە دژایەتی و بەڕادەیەك زۆربەی خێزانە هەقەکانی ناوچەی (سورداش و دوکان)ی بۆناوچەکانی (کەرکوك) ڕاگواست و هەندێك لەسەرکردەکانیشیان ڕاپێچی بەندیخانە کردن . هەربۆیە بزووتنەوەکە هێندەی نەخایاندو کپ بوەوە گەر بزووتنەوەی هەقە لەسەدەکانی ناوەڕاستدا هاتبایە کایەوە لەکوردستاندا هەڵبەت کارێکی زۆر گرنگی دەکردە سەر بزووتنەوەی کوردایەتی و لەتەریقەتیش تێپەڕی دەکرد چونکە نەك هەر ئایینی ئیسلامیان خۆماڵی دەکرد بەڵکو گەورەترین گۆڕانکاریان تیادا بەدی هێنابوو و زۆر بەئاسانی دەبووە ڕێکخەری تەواوی کۆمەڵگەی کوردەواری و کیانێکی سەربەخۆ، چونکە هەقە هەر لەپرەنسیبیدا باوەڕی بەڕێکو پێکی و کار دابەشکردن هەبوو، بۆیە زۆربەی جوتکارو ئاغایەکانی سنوری هەقە خەریکی کاری هەرەوەزی و دابەشکردنی بەروبومەکانیان بوون بەیەکسانی و بەبێ ئەوەی گوێ بدرێتە هەرشتێکی ئەو جوتیارە یان ئەو ئاغایە.. هەرچۆنێك بێ (بزووتنەوەی هەقە) سەرکوت کراو لەناوچەیەکی بچوکی کورستان زێتر هیچ لایەکی تری نەگرتەوەو ئێستاش تەنها لەدوو توێی نوسراوێکدا نەبێت لەهیچ شوێنێکەوە ڕەنگیان نەماوە . پاش بزووتنەوەی هەقە هیچ بزووتنەوەیەکی تری ئایینی وا لەکوردستاندا سەری هەڵنەدا کەشایەنی باس بێت

دیاره ئەمەش هەر لەخۆوە نەبووە چونکە کوردیش وەکو هەموو نەتەوەکانی تر بەرەو پیری بیرە پێشکەوتن خوازە جیهانیەکان چوو کەلەم سەدەی بیستەمدا گەیشتۆتە پۆپە .•

**هەروەها بەڕێز (دکتۆر ڕەشاد میران) لەپەرتوکی (ڕەوشی ئایینی و نەتەوەیی لەکوردستان،لاپەڕە٦٣، ٢٠٠٠) لەبارەی ڕێبازی هەقە دەڵێ:** ساڵی ١٩٢٠ لەئەنجامی پەرەسەندن و گەشەکردنی باوەڕو ناوەرۆکی تەریقەتی نەقشبەندیدا، دیاردەیەکی فیکری –ڕۆحی و بەگشتی کۆمەڵایەتی لەناوچەی (سورداش) ی کوردستانی خواروو سەری هەڵداو لەمەدا شێخ عبدالکریمی شەدەڵە لەناوچەکەدا دەوری باڵاو سەرەکی بینی . لەوە دەچێ شێخ عبدالکریم وەکو تەریقەیەکی ئایینی ڕووت و وشك سەیری نەقشبەندیی نەکردووە بەهۆیەوە بگات بە(الفناء فی الله) بەڵکو ئەم ویستوویەتی ئامۆژگاری و پرینسیبەکانی تەریقەکەی و هی ئایین بەگشتی لەبواری ژیانی کۆمەڵایەتیدا پیادە بکات و باوەڕ بە (یەکسانی) کە هەزاران ساڵ بوو ئیدیاڵی ئایین و مەزهەب و شۆڕشگێڕانی دونیابوو هەر لەخەباتدا بوون بۆی، ئەم واتە شێخ عبدالکریم هەنگاوێکی کاریگەرانەی نا بۆ دابینکردنی لەناو پەیڕەوی کۆمەڵەی پەیڕەوەکانی دا، ئەوەبوو شێخی ناوبراو بانگەشەی برایەتی و یەکسانی داو موڵکداریەتیی هاوبەشی پەیڕەوکەرانی خۆی ڕاگەیاند.

ئەم کارەی شێخ عبدالکریم گەلێ ڕادیکالانەبوو، بەتایبەتیش بۆ کۆمەڵگایەکی سەر بەپەیوەندی خێڵایەتی و دەرەبەگایەتی کە لەسەر بنچینەی موڵکداریەتی تاقە کەسی و چەوسانەوەو دەسەڵاتداری دامەزرابێ، بۆیەش هەقەکان واتە کۆمەڵەکەی شێخ عبدالکریم هەرزوو کەوتنە بەرهێرش و پەلاماری مەلاو شێخ و فەتواکانیان. هەقەکان لەژیانی ڕۆژانەیاندا دەبوایە زۆر بەتوندی ڕەچاوی دڵپاکی و ڕاستی بکەن، بەم بۆنەیەشەوە ئەمان وشەی (هەق) یان لەقسەو گفتوگۆدا زۆر دووبارە دەکردەوەو بۆیەش ناوی (هەقە)یان بەسەردا بڕا. وا دەردەکەوێ کە شێخ عبدالکریم و پەیڕەوکەرانی هەرچەندە کۆمەڵەیەکی ئایینیان پێکهێنابوو، زێتر مەترپالیست و ڕیالیست بوون لەوەی ئیدیالیست بن، چونکە ئەمانە بۆ گۆڕین و چاککردنی کۆمەڵگا وەکو چۆن کاك (محمدی مەلا کەریم) زۆر جوان بۆی چووە، چاوەڕوانی هاتنی (مەهدی) یان نەکرد بەڵکو لەجیاتی گەڕان بەدوای دادی کۆمەڵایەتیدا لەئاسمان لەسەرزەمین بۆی تێکۆشان . گۆڕانکاری هەرە گرنگ، ئەوەی هەقەکان دایان هێنا، لەلایەنی عەقاییدیەوە بوو/ پشتگوێ خستنی فەرزێکی گرنگ و سەرەکی ئیسلام وەکو نوێژ کردن، بەمەشەوە ڕق و دوژمنداریێتی خەڵکی مسوڵمان و ئیمانداریان بەسەردا باری، بەڵام هەقەکان هەرواو بێ بنچینە ئەم هەڵوێستەیان وەرنەگرتبوو، بەڵکو ئازایانە داکۆکییان لەبۆچوونی خۆیان دەکرد و هەر لەقورئان و شەریعەتەوە بەڵگەیان بۆ هەڵوێست و ڕەفتاری خۆیان دەهێنایەوە، مامە ڕەزا یەکێك لەشێخەکانی هەقە لەدەمەتەقێیەکیدا دەری بڕیوە کە ئەمان بۆیە وازیان لەنوێژ کردن هێناوە، چونکە گەیشتوون بە یەقین و ئەوەش بەپێی ئایەتی

---

• - پەڕاوێز

دیارە بەڕێز ( هاوڕێ باخەوان ) زانیاری پێویستی سەبارەت بە ( حەمە سور ) لەبەردەستدا نەبووە دەنا دەبوایە وەکو یەکێك لەڕێبەرەکانی ( بزووتنەوەی هەقە ) لەپاڵ ناوهێنانی ( شێخ عبدالکریمی شەدەڵە)و ( مامە ڕەزای کەلکە سماق ) ناوی ئەویشی هێنابایە – شمشارەی ژمارە (٥٠)ی مەلا سمایلی نورەدینی.

قورئان کەوتراوە **(وأعبد ربك حتى يأتيك اليقين)**. بەگوێرەی لێکدانەوەی هەقەکان بۆ ئەم ئایەتە کەبێگومان لێکدانەوەیەکی زیرەکانەیە،ئەگەر ئەمان گەیشتبن بەیەقین و دڵنیایی ئەوا چیتر پێویست بەنوێژکردن ناکات، بەلأم گۆڕانکاریەکانیان لەبواری کۆمەلأیەتیدا ڕادیکاڵیانەتریش بوون. هەقەکان هەموو موڵك و ماڵیان کرد بەیەك، دەوڵەمەندو هەژار نەما بەمەشەوە جیاوازی چینایەتیان نەهێشت، هەروەها ئافرەتیان ئازاد کردوو لەهەموو ڕوویەکەوە بوو بەهاوتای پیاو، لەئەنجامدا هەموو ئەو دەسکەوتانەی هەقەکان لەلایەن دەوڵەتەوە بە (کۆمۆنیزم) لەقەڵەم دران و هەر بەم تاوانەش ساڵی ١٩٤٤ مامەڕەزا بەند کرا . لەگەڵ ئەوەشدا کۆمەڵەی هەقە وەکو دیاردەیەکی مێژوویی و کۆمەلأیەتی کوردەواری دەورو بایەخی زۆری بووە، لەلایەنی فیکری و عەقاییدیشەوە دەتوانێ شان بدات لەشانی بزوتنەوە ئایینی و کۆمەلأیەتیە گەورەو پێشکەوتووخوازەکانی ناوچەکە، وەکو بزووتنەوەی (مەزدەکی) و بزووتنەوەی (بابەکی خوڕەمی) .

## بـزووتـنـەوەی هـەقـە لـەچـیـەوە سـەری هـەڵــدا ؟

**(محمدی مەلا کەریم) لەپێشەکی چاپی یەکەمی (ئاوڕدانەوەیەك لەبزووتنەوەی هەقە / مستەفا عەسکەری) لە لاپەڕە (٤)دا ساڵی ١٩٨٢ دەڵێ:** (لێکدانەوەی راستەقینەی واتای (هەقە) پێویستی بەپێداچوونەوەی بزووتنەوەی صۆفیەتی و بیرو باوەڕو ئایدیای (باتینیەکان و تاقمی ئەهلی هەق) و گەلێ لەو ڕێبازانەی ترە کە لەجیهانی ئیسلامدا پەیدابوون).

لەبەرئەوەش کەڕێبازی هەقە لەهەناوی تەریقەتی نەقشبەندی صۆفیگەری سەری هەڵداوە هەربۆیە بەپێویستمان زانی کە سەرەتا پوختەیەك لە بارەی تەریقەتی نەقشبەندی بخەینەڕوو:

## تــەریـقـەتـی نـەقــشــبــەنــدی

### وشەی (نەقشبەند) لەچیەوە هاتووە ؟

**(د . ئیبراهیم ئەحمەد شوان) لە پەڕتوکی (صۆفیگەری) لە لاپەڕە (٧٧)دا لەوبارەوە وتویەتی:** ئەم وشەیە وشەیەکی (فارسیە)و لەدوو بەش پێکهاتووە، یەکەم (نەقش) وێنەی ئەو مۆمەیە کە لەسەر مۆم و شتی تر دەدرێ، دووەم (بەند) بەواتای چەسپان و نەکوژانەوەیە، کەوابوو وشەکە بەگشتی واتای ئەوە دەگەیەنێت کە (زیکری خوا کار لەدڵ دەکاو لەناخیدا دەچەسپێت) .

لێرەدا ئەم دێڕە لەهۆنراوەیەکی (حاجی مەلا ڕەسوڵی دێلیژە – قەرەداغ) دەهێنینەوە سەبارەت بە وشەی (نەقشبەند) کەئێمە لە (ژمارە"٤٤"ی گۆڤاری شمشارە) وەکو دیکۆمێنتی مێژوویی بەدەست نووس بلأومان کردۆتەوە کەدەڵێ:

**لەسایەی شاهی نەقشبەندە لەلوتفی غەوسی بەغداوە**
**لەدڵدا نەقشبەندە بە نەقشی نەقشی هوَألله**

## ڕیشەی تەریقەتی نەقشبەندی

**(د. ئیبراهیم ئەحمەد شوان) لە پەرتوکی (صۆفیگەری)لە لاپەڕە(٧٧)دا لەوبارەوە نوسیویەتی:** ئەوانەی لەسەر ئەو تەریقەتەیان نوسیووە سەرەتا بۆ (ئەبوبەکری صدیق)ی دەگێڕنەوەو ناویان لێناوە (صدیقیە)، ئەم تەریقەتە هەر بەو ناوە مایەوە تا سەردەمی (ئەبو یەزیدی بەستامی / ٨٠٤ – ٨٧٧ ز)، ئینجا ناونرا (طیفوریة) تاسەردەمی (عبدالخالقی نەغجدەوانی) لەمەوە ناونرا (خواجەگانی) تاکاتی (محمد بەهائەدین النقشبندەوانی/ ١٣١٧ – ١٣٨٨ ز) ناوی لێنرا (تەریقەتی نەقشبەندی) جاهەندێ لەسەر ئەو ڕایەن کە لەو سەردەمەوە بەتەریقەتەکە گوتراوە (نەقشبەندی) و تائێستاش هەرواى پێدەڵێن . بەلاّم لەلایەکی ترەوە بیرو باوەڕی وا هەیە کە لەسەردەمی (شێخ عبداللە ی أحرار) تەریقەتەکە بوەتە (أحراریە) تا سەردەمی ٠ (ئیمامی ڕەبانی) کە بەنوێکەرەوەی (هەزارەی دووەمی کۆچی) ناسراوەو ناویان لەتەریقەتەکەنا (مجددیە) تا پەیدابوونی (مەولانا خالید نەقشبەندی) و تەریقەتەکە ناونرا (خالیدیە) . هەرچەندە تەریقەتی نەقشبەندی بەگوێرەی کەس و کات ناوی گۆڕاوەو هەر سەردەمێك بەناوی پیرێکەوە ناوبانگی دەرکردووە، بەلاّم لەلایەکی تر ڕای وا هەیە کە هەموو قۆناغەکانی ناو لێ بنرێ (تەریقەتی محمدی) و هیچ کەسێك بەخاوەنی تەریقەت نەزانێ و هەر خوا خۆی خاوەنیەتی **(الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ الْإِسْلَامَ دِينًا )** ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە تەریقەتی (نەقشبەندی) موو بەموو لەگەڵ شەریعەت دەڕواو سەرپێچی لە فەرمانەکانی ناکات . هەروەها بەرێز (ئەمین نەقشبەندی) لەپەرتوکی (تەریقەتی نەقشبەندی) نوسیویەتی کە (محەمەد بهأالدين بوخارا) ڕێبەری نەقشبەندی بووە، سەید محمەد بوخارا بە (شاهی نەقشبەند) ناسراوە پێش ناوی نەقش ناوی (خواجە) بەڕێبەرانی صۆفی گەری گوتراوە . تەریقەتی نەقشبەندی پێیان وایە ئەم تەریقەتە بۆ ئەبوبکری صدیق دەگەڕێتەوە . بەپێی بیروڕای نەقشبەندیەکان کاتێك کە أبوبکر لە ئەشکەوت لەگەڵ پێغەمبەردا بووە لە کۆچی یەکەمیان بۆ مەدینە زیکری (خەفی = شاراوە)ی کردووە. صۆفی گەری لەزاتە پیرۆزەکانەوە دەستی پێکردوە یەکەمجار (تابعین = توێژی پاش یارانی پێغەمبەر) ئینجا ناوی (زاهد) و (عابد) بۆ ئەوکەسانە بەکارهێنرا کە خوا پەرستی کەنارگیر بوون، لەدوای سەدەی (٢)شدا ناوی (صۆفی) لەوجۆرە خواپەرستانە نرا . پاش گەرانەوەی (مەولانا خالید) لە حەج کە لە سلێمانی بووە ڕۆژێك دەروێشێك خۆی کردووە بە مزگەوتی (عبدالرحمان پاشای بابان) ئەم دەروێشە خەڵکی (هیندستان) بووەو مریدی (قوتبی زەمانە) (شاعەبدوڵڵای دەهلەوی) بووە، دەروێشەکە ناوی (دەروێش محمدی) و لەقەبی (میرزا رەحیم الله)بووە.

### مەڵبەندەکانی نەقشەبەندی لە کوردستان

**مەڵبەندی تەوێڵە.**

**مەڵبەندی نەهری .**

**مەڵبەندی بارزان**

## جیـاوازی تـەریـقـەتـی ( قــادری ) و ( نـەقـشـبـەنـدی )

**(دکتۆر ابراهیم ئەحمەد شوان) لە پەڕتوکی (سۆفیگەری)لە لاپەڕە (٧٨)دا لەوبارەوە دەنوسیٚ:** ئەوەی راستی بیٚ جیاوازی هەرە گرنگی ئەم تەریقەتە لەگەڵ (قادری) لەسەر چۆنیەتی زیکرکردنی خوایە .ئەم زیکرە لەلای (نەقشبەندیەکان) نهێنییە و بەڵگەشیان ئەم ئایت و حەدیسەی خوارەوەیە ﴿وأذكر ربُّكَ في نفسك تضرعاً وخيفة ودون الجهر من القول﴾ . {ان فضل الذكر الخفي الذى لاتسمعه الحفظة على الذى تسمعه سبعون ضعفاً} .

زیکر لای (نەقشبەندیەکان بریتی یە لە نەهێشتنی بیٚ ئاگایی ئەمەش دووجۆرە بەزمان و بە دلٚ . زکری دڵیش کە تایبەتە بەم تەریقەتە دەبێتە دووبەش:

أ- زیکر بەناوی خودا واتا ناوی (الله)

ب- زیکر بە ئەری ٚ و نەریٚ (النفى والثبات)واتە بە (لااله الاالله) لێرەدا (لااله) نەرێییەو (الاالله) ئەرێیە .

### ئەوکەسانەی تەریقەتی نەقشبەندیان دامەزراندووە هیچیان عەرەب نەبوون

بەرێز (دکتۆر ابراهیم ئەحمەد شوان) لە پەڕتوکی (سۆفیگەری)لە لاپەڕە (٧٩)دا لەوبارەوە دەنوسیٚ: (ئەگەر سەرنجیٚ لەم تەریقەتە بدەین دەبینین کەوا ئەو کەڵە مێردانەی کە دایان مەزراندوە لەسەرەتاوە تا ئێستا هیچیان (عەرەب)نەبوونە و بە نەژاد نەچوونەتەوە سەر پێغەمبەر (د.خ). لەلایەکی ترەوە (تەریقەتی نەقشبەندی) بەوە بەناوبانگە کە لەهەموو ڕێگایەکانی دیکە سانا ترەو وەرزشی قورس و خۆئازاردانی زۆری تێدانیە لەمبارەیەوە دامەزرێنەرەکەی دەڵێت: (سەرەتای تەریقەتەکەمان کۆتایی تەریقەتەکانی ترە) .

### چۆنـیـەتـی گـەیـشـتـنـە خوا لای نـەقـشـبـەنـدیـەکــان

**(د.ابراهیم احمد شوان) لە پەڕتووکی (سۆفیگەری) لە لاپەڕە (٨٠) نووسیویەتی:**

ئەو ڕێبوارەی دەیەویٚ بەهۆی تەریقەتی نەقشبەندیەوە بگاتە مەبەست و دواقۆناغی خۆی دەبیٚ پەیڕەوی ئەم خاڵانە بکا:

١- دەبیٚ شێخێکی ڕاستەقینەی تەواو بە ڕێگای سۆزەوە ڕێبوارەکە بۆلای خۆی کێش بکا.

٢- دەبیٚ دڵی ڕێبوارەکە بە شێخێکەوە بەند بێت تا دەگاتە پلەی (بینین = شهود) .

٣- پێویستە ئەوزیکرانەی کە شێخ پێی ڕادەگەینیٚ جیٚ بە جێیان بکات .

٤-پێویستە دڵی ڕێبوار بە خواوە پەیوەست بێت و هەرگیز فەرامۆشی نەکاو وا بزانیٚ کە خوا ئاگای لە هەموو جوڵەیەکی هەیە.

# تـەریـقـەتـی نەقـشـبـەنـدی لـە کـوردسـتـان

**(د. ابراهیم ئەحمەد شوان) لە پەڕتوکی (صۆفی گەری)لاپەرە ۸۰دا نوسیویەتی:** هەموو سەرچاوە کۆن و نوێیەکان لەسەر ئەوە یەکن کەوا (شێخ خالیدی نەقشبەندی) ئەم تەریقەتەی لەسەردەستی (شێخ عەبدوڵڵای دەهلەوی) لە (هیند) وەرگرتووە و لەوکاتەدا لە کوردستان تەنیا تەریقەتی (قادری)باو بوەو تەریقەتی نەقشبەندی تا سەدەی (۱۳)ی کۆچی بلاّو نەببۆوە، هەر کە مەولانا خالید تەریقەتی نەقشبەندی لای شێخ عەبدوڵلا وەردەگریّ و دەگەڕێتەوە سلێمانی و ئەوکاتە سەردەمی (میرنشینی بابان) دەبێت و وا ڕێکدەکەویّ کە (شێخ مارفی نودێهی) لەوکاتەدا بلاّوکەرەوەو ڕابەری تەریقەتی قادری دەبیّ، هەرچەندە قادری لە پێش نەقشبەندی باو بوو بەلاّم کە مەولانا خالیدبوو بە ڕابەری نەقشبەندی لەوناوچەیەدا ئیتر خەڵکی لەهەموو لایەکەوە ڕوویان تێکردو لەسەردەستی ئەو تەریقەتیان وەرگرت، نابیّ ئەوەش لەبیر بکەین کە مەڵبەندی سەرەکی تەریقەتی (قادری) لەناوشاری(سلێمانی)بووە بەلاّم هی (نەقشبەندی) لە (بیارە و تەوێڵە) و (شارەزوور) بوو .

## لقەکانی تەریقەتی نەقشبەندی لەکوردستان

جێی ئاماژە پێکردنە کەوا تەریقەتی نەقشبەندی دواتر چەند لقێکی تری لێبۆتەوە وەکو (بنەماڵەی شێخەکانی بارزان) (بنەماڵەی شێخەکانی نەهری)و (بنەماڵەی شێخەکانی کەسنەزان) و (بنەماڵەی شێخەکانی بیارە و تەوێڵە).

## بـــەشـــی دووەم :

١- گوندی شەدەڵە مەڵبەندی سەرهەڵدانی بزووتنەوەی ( هەقە ).

٢- بەشێك لە مێژووی گوندی ( شەدەڵە ) سەر بە ناحیەی سورداش.

٣- سەرهەڵدانی بزوتنەوەی هەقە لەسەردەستی ( شێخ عبدالکریمی شەدەڵە ).

٤- شێخ عبدولکەریمی شەدەڵە دامەزرێنەری بزووتنەوەی هەقە.

٥- کەسایەتی شێخ عبدولکەریمی شەدەڵە.

٦- ناولێنانی بزووتنەوەکە بەهەقە.

٧- شێتەکان لەناو هەقەدا کێ بوون؟

٨- حەمە جووجەی سەرگەڵوو نمونەیەك بۆ شێتەکانی هەقە

٩- گونیە لەبەرکردن لەسەردەمی شێخ عبدولکەریمدا نیشانەی نەفس شکاندن بووە.

١٠- زاراوەکانی ( سەرتەکیە، برا سەیار، موخلیس، مونکیر ) لەکاتی بزووتنەوەی هەقە چی بوون؟

١١- بۆچی هەقەکان بەتەقەی هەرشتێك و دەست لەکەلەکەدان هەڵچوون و تورەبوون؟.

١٢- ئایا نەریت و دیاردەکانی ( چرا پف، شەوە رەشە، زگەرووتە ) لەناو هەقەکاندا بوونیان هەبووە؟

١٣- باری ئاسایش و ئارامی و تەبایی هەقەکان

١٤- کۆچی دواییکردنەکەی شێخ عبدولکریمی شەدەڵە.

١٥- چارەنووسی بزووتنەوەی هەقە لەدوای کۆچیدوایی کردنی دامەزرێنەرەکەی.

## گوندی (شەدەڵە) مەڵبەندی سەرهەڵدانی بزووتنەوەی (هەقە)

## بەشێك لە مێژووی گوندی (شەدەڵە) سەربەناحیەی سورداش

**(شێخ محمود کاکە حەمە شێخ عبدالکریمی شەدەڵە) لە بارەی بەشێك لە مێژووی گوندەکە ووتی:**

١- **ناوەکەی:** بەهۆی ئەوە کە گوندەکە کەوتۆتە دۆڵێکی درێژەوە و کاتی خۆیشی دارستانی چڕی لێ بووە وتراوە(شادارە) یان (شادۆڵ) پاشان لەدەربڕیندا بووە بە (شەدەڵە) .

### ٢- ئاوەدانکردنەوەی یەکەمجاری گوندەکە :

یەکەمجار گوندەکە لەلایەن (حاجی شێخ محمودی شێخ قادری سور) کە لە گوندی (سەرگەڵوو)ەوە هاتووە لە نزیکەی ١٨٥٠زاینی ئاوەدانکراوەتەوە. دوای ئەویش (حاجی شێخ مستەفای عەسکەر– باوکی شێخ عبدالکریمە شەودەڵە)هاتووە بۆ گوندەکەو دواتر وردە وردە خەڵکی تریش وەکو (حاجی حوسێن ژاژەڵە) و (فقێ احمد) هاتوون و ئینجا وردە وردە خەڵکی تری ناوچەکانی تریش لە گوندەکە نیشتەجێبوون .

**هێرشێکی سوپای دەوڵەتی تورکی عوسمانی بۆ شەدەڵە:**- لە مانگی (١٩١٤/٥) هێزێکی سەربازی دەوڵەتی تورکی عوسمانی هێرش دێننە سەر دۆڵەکەی شەدەڵە . (شێخ یوسف) کوڕی ئەو شێخ محمودەی کە گوندەکەی ئاوەدانکردۆتەوە بە هێزێکەوە دەچێتە (سورداش) بۆ ڕێگە گرتن لە هاتنی هێزی تورکەکان و شەڕێکی گەورە بەرپا دەبێ و ژمارەیەکی سەرباز لە هێزی تورکەکان دەکوژرێن و چەند کەسێکیش لە هێزەکەی شێخ یوسف بریندار دەبن، دواتر تورکەکان پێشڕەوی دەکەن و گوندی شەدەڵە داگیر دەکەن و تەواوی گوندەکە دەسوتێنن.

**بۆردومانی فرۆکەی ئینگلیزەکان:** دوای شەڕی (جاسەنە) لە نێوان ئینگلیزەکان و شێخ محمودا لە ساڵی (١٩١٩) شێخ محمود سەردانی (شێخ عبدالکریمی شەدەڵە) دەکات بۆ ڕاوێژ پێکردنی سەبارەت بە بارودۆخەکە . شێخ عبدلکەریمی شەدەڵە پێشنیار بۆ شێخ محمود دەکات کە باشتر وایە ڕووبکاتە سنوری (شارباژێڕ) کە لەوێ زیاتر خەڵك پشتیوانی لێ دەکات. ڕۆژی دواتری ئەم سەردانەی شێخ محمود بۆ شەدەڵە لە بەیانیەکەییدا فرۆکەی ئینگلیزەکان دێنە ئاسمانی شەدەڵەو گوندەکە بۆردومان دەکەن، بۆردومانەکە خانەقای (شێخ عبدالکریم) دەگرێتەوە کە دەبێتە هۆی ژیان لەدەست دانی (سۆفی حمەدەمین) و برینداربوونی چوار سۆفی تر و ژمارەیەکیش مەڕو ماڵات و پەلەوەری گوندەکەش دەکوژرێن دواتریش ئینگلیزەکان هێرش دەبەنە شەدەڵەو تەواوی گوندەکە دەسوتێنن. کە پێشتر خەڵکەکە چۆڵیان کردبوو.

### بۆردومانی فرۆکەی ڕژێمەکانی عێراق:

١– یەکێ لە ڕۆژەکانی هاوینی ساڵی ١٩٦٣دوو فرۆکەی ڕژێمەکەی (عبدالسلام عارف)بە بۆمبی تێزاب بۆردومانی گوندەکە دەکەن، بەو هۆیەوە لە ٧٠٪ی گوندەکە ئاگردەگرێ و دوکەسیش بریندار دەبن.

٢– یەکێ لە ڕۆژەکانی مانگی (١٠)ی ساڵی (١٩٦٥) هێزێکی ڕژێمەکەی (عبدالسلام عارف) بە پشتیوانی چەکداری کورد لە چیای (پیرە مەگرون)ەوە هێرش دەباتە سەر گوندەکەو گەمارۆی گوندەکە دەدەن و دەست دەکەن بە سوتانی تەواوی گوندەکە، کە خەڵکەکەی لە ترسان پێشتر چۆڵیان کردبوو.

٣–عەسری یەکێ لە ڕۆژەکانی ڕەمەزانی کۆتایی هاوینی ساڵی ١٩٧٤ چوار فڕۆکەی ڕژێمەکەی(احمد حسن بكر) بۆردومانی چڕی گوندەکە دەکەن . بۆردومانەکە زیاتر (ڕەزی تەباران) دەگرێتەوە، کەدەبێتە هۆی ژیان لەدەست دانی شەش کەس (١– مستەفا هەڵەدنی ٢– بەکری حاجی حەسەن ٣– کوڕێکی محمد علی ٤– پێشمەرگەیەکی گەرمیان ٥و٦ دووکچی منداڵی شێخ صدیق شێخ احمد و برینداربوونی و هاوسەرەکەی شێخ صدیق بەناوی مەلیحە شێخ حەمەد) .

**چۆڵکردن و سوتاندن و ڕاگواستنی گوندەکە لەلایەن ڕژێمەکەی صدام حسێن:-**

**یەکەمجار:** لەساڵی ١٩٨٥ خەڵکی گوندەکە بەهۆی بارودۆخی شەڕ گوندەکەیان چۆڵ دەکەن. ڕۆژێکیان لیوایەکی (قوە خاصە) و دوو فەوجی سەربازی ڕژێمەکەی (صدام حسێن) گوندەکە داگیردەکەن و تەواوی گوندەکە دەسوتێنن .

**دووەمجار:** لە ١٩٨٨/٢/١٨ لە میانەی (ئەنفالی یەك) شەڕێکی سەخت لە نێوان پێشمەرگەکانی (ی . ن . ك) و سوپای رژێمەکەی (صدام حسێن) لە چیای (قوڵە پوشینە و قوڵە سەوز) ڕوو دەدات، پاشان هێزەکانی ڕژێمەکە گوندەکە داگیر دەکەن و تەواوی گوندەکە دەسوتێنن کە خەڵکەکە پێشتر لە ترسان چۆڵیان کردبوو، پەرتەوازەی ئێران و شوێنەکانی تری ژێر دەسەڵاتی ڕژێمەکە بوون تا سەرکەوتنی ڕاپەرینەکەی ١٩٩١ ئاوەدان دەکرێتەوە.

**سەرهەڵدانی بزوتنەوەی هەقە لەسەردەستی ( شێخ عبدالکریمی شەدەڵە )**

**لەپاشکۆی پەڕتوکی (ڕاپەرینی عەلەوییەکانی زاگرۆس)- نوسینی (محمد علی سوڵتانی) وەرگێڕانی بۆکوردی (حسن عبدالكريم و کەمال ڕەشید) لەباسی بزافی حەقە لە (کەرکوك) لە لاپەڕە (٢٣٧)دا نوسراوە:** (شەدەڵە) گوندێکە لەناوچەی (سورداش) سەر بە پارێزگای (سلێمانی –کوردستانی عێراق) لە کۆتایی ساڵانی(١٩٢٠ ز – ١٣٣٨ ك مانگی – ١٢٩٩ی کۆچی هەتاوی) لەو گوندە خنجیلانەیەدا بزافی حەقە لەسەردەستی (شێخ عبدالكريم – کوڕی حاجی شێخ مستەفا – کوڕی حاجی شێخ ڕەزای عەسکەر)بنیات نرا . حاجی شێخ ڕەزای باپیرەی شێخ عبدالکریم خەڵکی گوندی (عەسکەر) ی ناوچەی (ئاغجەلەر) بوو. کە پێشتریش (شێخ موسای بەرزنجی)لێوە هەڵکەوتبوو . ئەم بنەماڵەیە لە (سەیدە عەلەوییە بەرزنجیەکانە) و سولالەی سەیدیان دەگاتەوە (شێخ عیسای بەرزنجی هەمەدانی) باوکی (سوڵتان سەید ئیسحاق عەلەوی بەرزنجی) . حاجی شێخ مستەفای باوکی شێخ عەبدوالکریم لە جەنگی یەکەمی جیهاندا بۆ ڕووبە ڕوو بوونەوەی هێزەکانی ئینگلیز چووە باشوری عێراق و لە ساڵی (١٢٢٣)ك لەبەغدا کۆچی دوای کردو لە گۆرستانی (شێخ مەعروفی کەرخی) دا بەخاك سپێردرا و پاشان مەزارەکەی بۆ گۆرەستانی (شێخ جونەیدی بەغدادی)گواسترایەوە . ئەم بنەماڵەیە تاکاتی دەست بە ئیرشادکردنی (مەولانا خالیدنەقشبەندی – ١١٩٠ – ١٢٤٢ ی کۆچی ) لە کوردستان لەسەر تەریقەتی (شێخ عبدالقادری گەیلانی) کە میراتی باوباپیرانی بوو ئیرشادی دەکرد بەڵام پاشان لەبەرئەوەی کەوتە ژێر کاریگەری ئیرشادی مەولانا خالیدی نەقشبەندییەوە دەستی ئیرادەتی دەداتە دەست و لەسەر بنەمای تەریقەتی

نەقشبەندی ئیرشادی دەکرد لە لاپەڕە(٢٣٨) یەکەمین کەسایەتی ئەم بنەماڵەیە کە تەریقەتی نەقشبەندی هەڵبژارد (شێخ ئەحمەدی سەردار) بوو . ساڵی ١٩٢١ شێخ عبدالکریمی شەدەڵە کاری ئیرشادو تەبلیغ دەگرێتە ئەستۆو لایەنگرانێکی زۆر لە (سورداش، مەرگە، میرزارۆستەم، بەری کۆیە، ئاغجەلەر، شوان) و هتد.. پەیدا دەکات. بەدەست پێکردنی خەلیفایەتی شێخ عبدالکریمی شەدەڵە بزافی حەقە، کە گەرانەوەیەك بوو لە نەقشبەندییەوە بۆ رێورەسمی (عەلەوییە توندرەوەکان – ئەهلی حەقە – ئالی حەق) لە سنوری ئیرشادی شێخ عبدالکریم دا، بزافەکە لەکاتی ڕێبەری و ئیرشادکردنی شێخ عبدالکریمداو لەسەر تەریقەتی نەقشبەندی دەستی پێکرد .

## ( شێخ عبدالکریمی شەدەڵە ) دامەزرێنەری بزووتنەوەی ( هەقە )

**لەپەڕتووکی (ڕاپەڕینی عەلەوییەکانی زاگرۆس، یان لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی لەسەر ئەهلی حەق، نوسینی (محمد علی سوڵتانی، وەرگێڕان (حسن عبدالکریم و کەماڵ ڕەشید، ل ٢٤١) بەم جۆرە پێناسەی (شێخ عبدالکریمی شەدەڵە) کراوەو وتراوە:** ساڵی لەدایکبوونی (شێخ عبدالکریم) بەتەواوەتی دیار نیە بەڵام بەهۆی بەڵگەو ئاسەوارە جێماوەکانەوە مەزەندە دەکرێ دەوروبەری ساڵی (١٣١٠ ك، ١٨٩٢ – ١٨٩٣ ز) لەدایك بووبێ بەڕواڵەت پیاوێکی گەنم ڕەنگ باڵا مام ناوەند دەم و چاو پان و دووچاوی گەورەی بووە، هەروەها زانستخواز بووەو زانستە باوەکانی ئەو ڕۆژەی لە (صرف و نحو و بەلاغە و تەفسیر و فیقه و ئوصول) خوێندبوو، ئیجازەی فتوا و وانە ووتنەوەی زانستە ئاینیەکانی لە (مەلا عبدالله ی جەلی – کۆیە) وەر گرتبوو، هەرسێ زمانی (عەرەبی، فارسی، تورکی) بەباشی دەزانی و دەنوسی، دایکی ناوی (ئامینە خانم) کچی (شێخ عبدالسلام قازی) بوو، (شێخ عبدالکریم) دووجار بۆ حەج چووە، ئەو کەسایەتیە زانستی و ئایینیە ساڵی (١٣٦١ ك) لە گوندی (شەدەڵە) کۆچی دوایی کردووەو هەر لەوێ بەخاك سپێردراوە .

بەڕێز (شێخ محمود کاکە حەمە شێخ عبدالکەریم)ی شەدەڵە لەدایکبووی ١٩٥٤ کەئێستاکە براگەورەی بنەماڵەی (شێخ عبدالکریم)ە لە شەدەڵە وتی: ١–باپیرەم لەکاتی خۆیدا گەورە بەبچوك و شیربایی ژن خوازی حەرام کردووە، ٢– نوشتەو دەست ماچکردنی بەخەراپ زانیوە، ٣– کە یەکێك پێش مردنی وەسیەتی کردبێ ماڵ و ملکی بۆ شێخەکەی بێت ئەو حەرامی کردووە لەسەر خۆی .

## کەسێتی (شێخ عبدالکریمی شەدەڵە)

**هەر لەهەمان پەڕتووکی پێشوداو لەبارەی کەسایەتی (شێخ عبدالکریمی شەدەڵە)لە لاپەڕە(٢٤١)دا وتراوە:** (شێخ عبدالکریمی شەدەڵە) یەکێکە لەکەسایەتیە جێ باس و سەرنج و ئازاکان، بەڵام بەهۆی دەمارگیریی قەڵەم بەدەستەکانی ئەوکاتەی عیراق و لەبەرئەوەی بەدرێژایی تەمەنی شێخ عبدالکریم بزافە هاوچەرخ و گەڕانەوەکەی خۆی تێکەڵ بەپروپاگەندەی ئینگلیز و وڵاتە بیانیەکان نەکرد بۆیە پلەی ئایینی و فیکری ئەم کەسایەتیە بەتەمومژاوی و نادیاری مایەوە، هەروەها سەرەڕای لێدان و دووبەرەکی دروست کردن و هەڵکوتانە سەر کەچی پەیڕەوانی شێخ عبدالکریم وەك تێکۆشەرەکانی تری ڕێبازی (عەلەوی) لەوانە (سەید ڕەزای دەرسیمی) لە (کوردستانی باکور – تورکیا) بەکۆڵنەدەری و پتەوی مانەوە . ئەو وتانەی شێخ عبدالکریم لەسەر زەمینی زانست و ئایین و دەمارگیری و باوەڕ لەکوردستاندا ڕای گەیاند بۆکاتی خۆی هیچی لەوتەکەی (أنا الحق) ی (منصوری هلاج) کەمتر نەبوو، ئەگەر کەسێك ئاشنای بارودۆخی کۆمەڵایەتی و بیروباوەڕی ناوچەکە نەبێت نازانێت کەئامرازی ئەم سەلیقەو مەیل و باوەڕە لەوکات و ماوە مێژوییەو لەو سنورە جوگرافیەدا چەند بوێری پێویست بووە، هەروەها خاوەنی ئەم وتەیە چەند تانەو لۆمەو ئازاری بەگیان کڕیوە تابتوانێ ئەندێشەی فیکری و ئایینی خۆی لەپێناو بەرز ڕاگرتنی ژیانی شەرەفمەندانە گوزارشت بکات و برەوی پێبدات . ئەو پرۆسەیەش لەهەناوی تەریقەتێکدا ئەنجام بدات کە لەسەرتاسەری کوردستاندا یەك سەرە مویەك ناکۆکی شەرعی لەنێوان کەڵە پیاوە گەورەکان و موریدە گیان لەبەر دەستەکانیدا نەبینرا.

**لەپەڕتوکی (ئاوڕدانەویەك لەبزوتنەوەی هەقە – مستەفا عەسکەری)لە لاپەڕە(٢٩)دا دا هاتووە:** پێوەندیی (شێخ عبدالکریم) بەزۆر لەناودارانی کوردەواری سەردەمی خۆیەوە بەهێز بووە، بۆنمونە پێش (شەڕی کۆتەڵ) پیوەندی بە(شێخ محمود)ی نەمرەوە هەبووەو بەڵێنی یارمەتیدانی داوەتێ کە ئەوەبو لەو شەڕەدا ژمارەیەکی زۆر لەخزمانی (شێخ عبدالکریم) و عەشایری ناوچەی (ئاغجەلەر) بەفەرمانی شێخ و بەسەرۆکایەتی (شێخ عبداللە)ی برای لەگەڵ (کاکە ڕەزا ی باوکی کاکە علی عەسکری)دا شاخی (گەورەدێ) یان بۆ پاڵپشتی لەشکری (شێخ محمودی نەمر) و ڕێگرتن لەهێرشی سوپای ئینگلیزەکان لەو ناوچەیەوە بۆ سەر (کۆتەڵ) گرت و تا شەڕ کۆتایی نەهات هەروەها (شێخ محمود) فەرمانی دابونێ سەنگەری خۆایانیان چۆڵ نەکرد، هەر بەم هۆیەشەوە بوو گوندی (شەدەڵە) بۆمب باران کراو ماڵ و منداڵی (شێخ عبدالکریم) گوندەکە بەجێ بهێڵن و بچنە ئەشکەوتی (بۆڵەترێ) کە لەپشت شەدەڵەوە لەشاخی (دابان) و پاش ئەوەش چوونە ناوچەی (مێرگە پان) .

## ناولێنانی (بزووتنەوەی هەقە) بە (هەقە)

**مستەفاعەسکەری لەپەرتوکی (ئاوڕدانەوەیەك لەبزووتنەوەی هەقە / ل ٣٨ – ٣٩)دا دەڵێ:** (وەك هەر کۆمەڵە صۆفییەکی تر هەمیشە هەقەکان لەخانەقای شێخ دا جەزبە گرتوونی و ئاگایان لەخۆیان نەماوەو کەوتوونەتە (ألله ألله) و (یاحق یاحق) کردن و لەڕوویەکی تریشەوە بەهۆی شانازی کردنیانەوە بەو ڕێبازەی گرتوویانەتە بەر زۆر وشەی (هەق) و (هەقە) یان بەسەر زماندا هاتووەو لەمەوە لەناو خەڵکدا بە (هەقە) یان (حەقە) ناوبانگیان دەرکردووە) .

**لەپەڕتوکی (ڕاپەڕینی عەلەوییەکانی زاگرۆس، یان لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی لەسەر ئەهلی حەق، نوسینی (محمد علی سوڵتانی، وەرگێڕان (حسن عبدالکریم و کەمال ڕەشید) وتراوە:** ئەگەرچی ناولێنانی بزافە نوێیەکە وادیارە لەو زیکر کردنە بەردەوامەی پەیڕەوانی بزافەکەوە هاتووە کەوشەی (حق) یان ووتوەتەوە و دوپاتیان کردۆتەوە بەلاّم ئەوەش بزانین کەوشەی (هەقە) زیکری بەردەوامی (عەلەوییە توندڕەوەکان – ئەهلی حق – ئالی حق) بووەو ئەم ناولێنانە هەروا بەسانایی و بەڕێکەوت هەڵنەبژێردراوە.

## شـێـتـەکـان لـەنـاو هـەقـەدا کـێ بـوون ؟

**هەژار موکریانی: دەیانگوت هەرکەس چەند ڕۆژێك لە (شەدەڵە) بێت عەقڵی دەگۆڕێت (پەڕتووکی چێشتی مجێور، لا٥٠٥).**

**لەپەڕتوکی (ئاوڕدانەویەك لەبزوتنەوەی هەقە – مستەفا عەسکەری) دا و لەبابەتی (هەقەکان و نەریتە ئایینیەکاندا)لە لاپەڕە(٥٢)دا هاتووە:** (کەزۆرتری هەقەکان نوێژیان نەدەکردوو ڕۆژویان نەدەگرت و گەلێك لە ڕێوشوێنی ئایینیان واز لێ هێنابوو، خەڵکی دەور و پشت ئەمەیان بەنیشانەی ئەوە دادەنا کە (هەقەکان) خوا نەناسن لەڕاستیدا هەقەکان خوانەناس نەبوون و باوەڕیان بەخواو پێغەمبەر و قورئان و فەرمانەکانی شەرع زۆر پتەو بوو، خۆیان وا دادەنا کەخواناسی ڕاستەقینەن و هەقپەرستن، پەندو ئامۆژگاریەکانی (شێخ عبدالکریم) (مامە ڕەزا)یش هەرگیز شتی وایان تێدا نەبووە کە کەس نوێژ نەکاو ڕۆژوو نەگرێ یان پێچەوانەی شەریعەت بجوڵێتەوە . صۆفی و موریدەکانی (شێخ عبدالکریم) بەوازهێنان وازیان لەنوێژو ڕۆژوو ڕێ و شوێنی تری شەرع نەهێنابوو تەنیا ئەو تاقمەیان دەست بەرداری ئەو ڕێوو شوێنانە بوون کەناویان لێنرابوو (برا سەیار) کە بەهۆی حاڵەتی (وجد و جەزب)ەوە لەکاتی خۆیدا دەست بەرداری هەموو شتێك بوو بوون، هەر لەماڵ و منداڵ و داراییەوە بیگرە تا داب و نەریتی ئایینیش وەك شێت بەدێهاتەکاندا دەگەڕان تەنانەت لەبەرئەوە لەزۆر شوێنیش پێیان دەوتن (شێتەکان) لەسەردەمی (مامە ڕەزا) دا زۆرتری صۆفی و موریدەکان لەسەر نویژو ڕۆژی خۆیان بەردەوام بوون و (مامە ڕەزا) خۆیشی لەکاتی نوێژی بەیانیدا بەسەر بەرماڵەوە تووشی نەخۆشی مەرگ بوو) .

**لەپەراوێزی ژمارە (٢)ی لاپەڕە(٥٣) ئەم بابەتەدا لەلایەن (محمدی مەلا کەریم) وتراوە:** (شێخ حسێنی خانەقا) لەم بارەیەوە دەڵێ ئەم حاڵەتی جەزبەو ئەو قسە هەلەق و مەلەقانەی صۆفی لەحاڵەتی جەزبەدا دەیانکات کەپێیان دەڵێن (شەتەحات) جۆرە سەربەستییەکی بیرکردنەوەو قسەکردنی لەناو تێکڕای هەقەکاندا کردبوو بە باو کە ئەمەش دەبوو بەهۆی پەیدابوونی گەلێ مشت و مڕی فەلسەفی لەبارەی خواپەرستی و یەکێتی گەردوون و ئەمجۆرە بابەتانەوە، یەکێ لەمانەش (مەلا سەلامی کوڕی مەلا مستەفای ترێ خۆر) بوو ئەم زاتە حاڵەتی جەزبەکەی بەعلومی دینیەوە گرتبووی و گەیاندبووی بەباوەڕ بە فەلسەفەی (جبریە) کە سەلبی (جوزئی ئیختیار) لە ئادەمیزاد دەکات تەنانەت وای لێهاتبوو نوێژی نەدەکردوو هەمیشە لەگەڵ خۆیدا خەریکی محاکەمەی فەلسەفی بوو دیارە ئەم جۆرە حاڵەتە ڕێی بۆ زۆر کەسی نەخوێندەواریش بەڕەڵا کردبوو هەریەکە بەجۆرێك خۆیان لەقەرەی ئەم مەسەلەیە بدەن بەتایبەتی سێ کەس کە پاشان پێوەندیان بە (مەلا سەلام)ەوە نەما (ئەحمەد شەربە، ڕەزا هەڵەدەنی، حەمەسور) ئەم سێ یانە هەمیشە لەناو خۆیاندا لەباسی بوون و نەبوونی

خواو شتی وا دابوون و هەرچەندە پێوەندیان لەگەڵ خەڵکدا نەبوو مەبەستیشان نەبوو خەڵك گوێیان لەقسەکانیان بێت یانا ئەمانە گەیشتنە پلەیەك دەست لەدنیا بشۆرن و دەست داشۆردنەکەشیان وای لێهاتبوو پێوەندیان لەگەڵ هەموو جۆرە نیزامێك بڕابوو، هەربۆیەش نوێژیان نەدەکردوو نوێژ کردنیان بەجۆرە سەردانەواندنێك بۆ ئیلتیزاماتی دنیا دادەنا، ئەمانیش هەر چاوەڕێی (محمدی مەهدی) بوون کە بێ و دنیای پڕ جەورو ستەم چاك بکات، هەروەهابەڕێز (محمدی مەلا کەریم) لەپەراوێزی ئەم بابەتەدا دەنوسێت: لەپوختەی ئەم بەشەوە دەتوانین بگەینە ئەوەی کەچینی یەکەمی پیاوە بەڕێوەبەرو قسە ڕەواکانی کۆمەڵەی (هەقە) جگە لە (شێخ عبدالکریم و مامە ڕەزا) نیمچە (باطنیة) ێکیان تێدا بووەو بۆخۆیانیان ڕەوا بینیوە بەپێویستی نەزانن لەسەر پێڕەو لێکردنی نەریتەکانی ئایین سوربن، بۆیەش (شێخ عبدالکریم و مامە ڕەزا)م لەمە لاخست چونکە شتی وایان لێ هەست پێنەکراوە بەڵکو بەپێچەوانەوە بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لام وایە ئەم هەڵوێستە لەلایەن ئەم دوانەوە تەنیا (تەکتیك) بووە ئەگینا ئەقڵ نایگرێ صۆفی وا بەئاشکرا لەڕێبازی شێخ بەلەسە ببێ کەچی هێشتا شێخ بەشێخی و صۆفی بەصۆفیەتی بمێنێتەوەو لە یەکتری نەبنەوە، **هەروەها لەپەرتوکی (ڕاپەڕینی عەلەوییەکانی زاگرۆس) کە (محمد علی سوڵتانی) نوسیویەتی و (حسن عبدالکریم و کەماڵ ڕەشید) لەفارسیەوە وەریان گێڕاوەتە سەر زمانی (کوردی) لە لاپەڕە(٢٤٢)دا لەوبارەوە نوسراوە:** (شێخ حسێنی خانەقا) کەپیاوێکی ئاگادارو بەتەمەن و هاودەم و هاوچەرخی (شێخ عبدالکریم) بووە دەربارەی سەرەتای بزافی حەقە دەڵێ: شێخەکانی هەقە سەرەتا وەك بنەماڵە نەقشبەندیەکانی ترو بەگوێرەی ڕەوشی باو (ئیرشا دو سلوکیان) دەکرد، بەڵام لەکاتی خەلیفایەتی (شێخ عبدالکریم) دا ووردە ووردە لەناو موریدە پەیڕەوەکانی شەرعدا کە پاش تەواوکردنی زانستی حەوزەو وەرگرتنی ئیجازە لەشوێن و ناوچە جیا جیاکانی کوردستانەوە دەهاتنە ڕیزی بزافەکەوە قسەو شەتەحات کردن دەستی پێکردوو ژمارەیەك بەبیانوی ئەوەی کاتی دەرکەوتنی (مەهدی) نزیك بۆتەوەو زەمینەی دەرکەوتنی لەبارە پاشان ووردە ووردە دەستیان بە تەرك کردنی حوکمە تاکڕەویەکان کردوو پاشتر لەپلەی پێشکەوتوو تردا ڕوویان لەکارو باری دنیایی وەرگێڕاو دەستیان لەکارو بار هەڵگرت، ئەو جۆرە کەسانە خاوەنی فیکرو باوەڕ و فەلسەفەیەکی قوڵیش بوون . لەگەڵ سەرهەڵدانی ئەو بیرو باوەڕەدا ژمارەیەکی زۆری خەڵك بەتایبەتی کەسانی سادە پەیوەندیان پێوە کردن و لەنێوان هاوولاتیانی ناوچەکەدا بە (شێت) ناو دەبران کە وەکو جاران و لەسەر تەریقەتی نەقشبەندی ڕەفتاریان دەکرد بەگوێرەی ڕەوشی باو (صۆفی) یان پێ دەوترا . خودی (شێخ عبدالکریم) بەو ڕەوتەو ئاشکراکردنی ڕازی نەبوو تەنانەت جارێکیان (حەمە سور) کە یەکێك بووە لە موریدە سادەو توندڕەوەکانی (شێخ عبدالکریم) لەبەرئەوەی لەبەردەمی شێخدا دانی بەوە داناوە کە لەو بڕوایەدایە أحکامی شەریعەت بەسەر چووە بە فەرمانی شێخ دارکاری کراوەو داوای لێکراوە لەقسەی خۆی پەشیمان بێتەوە، بەڵام (حەمەسور) پێی لەسەر باوەڕو قسەکانی خۆی داگرتووە هەروەها شێخ حسێنی خانەقا دەڵێ: ژمارەیەك زانای ئاینی ئەهلی تەسەوفیش هەبوون کە بەهەموو دڵێکەوە لە بزافە نوێیەکەدا بوون بەو مەرجەی مسەلە شەریعەتیەکانیش رەچاو بکرێن، کەچی لەترسی کاردانەوەی کۆمەڵایەتی و ڕووبەڕووبونەوەی خەڵکی بیرو باوەڕەی خۆیان دەشاردەوە.

هەروەها لە حەقیقەتنامەکەی (حەمەسور)دا بەمجۆرە گوزارشت لە شێتی حەقەکان کراوە کە دەڵێ:

**ـــ بابزانین مانای شێتی چیە ؟**

**ئێمە شێتی تەریقەتین**

**مانای شێتی هەقیقەتە**

**مانای هەقیقەت خوێندنە**

**مانای خوێندن سەعی کردنە**

**مانای سەعی کردن عەقڵ و کەماڵە**

**مانای عەقڵ و کەماڵ تەرتیباتە**

**چونکی تەرتیبات بۆ هەق شوناسی ئیسپاتە**

**کەسێ لەسەر ئەم شەراییتانە ئیکمالە**

**هەر ئەو هەبووەو کەریمی مالە.**

## حەمەی جوجەی سەرگەڵو: نمونونەیەك بۆ شێتەکانی هەقە

(حەمە جوجە) لەدایکبووی ١٩٢١ سەرگەڵو کەدەبێتە مریدی شێخ عبدالکریمی شەدەڵە دەست بەرداری خۆشی ژیانی دنیا دەبێ و وەکو شێت بەردەوام کراسێکی سپی درێژی لەبەر کردووەو هەمیشە بێ نوتق بووەو قسەی لەگەڵ کەسدا نەکردووەو بەڕۆژ بەردەوام لەناو چەمەکەی نێوان (سەرگەڵو و بەرگەڵوو) دەسوڕایەوەو بەردی لەسەر ڕێگایەکان کۆ دەکردەوە، بەزستانیش لەسەر تەندورەکانی دێیەکە دەمایەوەو داوای هیچ شتێکی هەتا نان و ئاویشی لەخەڵك نەکردووە و خەڵکی دێیەکە خۆیان نانیان بۆی دەبرد، دوای ئازادبوونی لەگرتوخانەی (نوگرە سەلمان) دواجار لەساڵی نەوەدەکان لەناو شاری سلێمانی دەکەوێتە ژێر ئۆتۆمبێل و ژیانی لەدەست دەدات، جێی ئاماژە پێکردنیشە کە لە ١٨/٣/١٩٨٨ دوای ئەوەی سوپای ڕژێمەکەی صدام حسێن دەستیگرت بەسەر سەرکردایەتی (یەکێتی نیشتیمانی کوردستان)دا لە(سەرگەڵوو) لەمیانەی ئەنفالی(١) حەمە جوجەش لە (بەرگەڵو) دەستگیر دەکەن و لە کەناڵی تەلەفزیۆنی عیراقی ئەوکات و لەبەیاننامەی سەربازیدا بە قائیدی حەرەکەیەك ناساندبویان .

(سوارە سەرگەڵویی) بۆی باسکردین و گوتی: دایکم (خەیاڵێ ئەحە شێتی) کەتەمەنی ٦٥ ساڵ بوو، لەساڵی ٢٠٠٧ لە(ڕانیە) کۆچی دوایی کرد یەکێ بوو لەهاولاتیەکانی گوندی (سەرگەڵو) کە لەمیانەی **(ئەنفالی یەك)** بۆ سنورەکە چوونە ئێران و گەڕانەوە بۆعیراق لە سەیتەرەکەی (گۆجاری سونێی پشدەر) لەلایەن سوپای ڕژێمەکەی (صدام حسێن) لەگەڵ ژمارەیەك لەخەڵکی (سەرگەڵو) دەستگیر دەکرێن، کە لەوێوە دەگوازرێنەوە بۆ فیرقەی(٢٤)ی (چوارقوڕنە) ئینجا بۆ (سلێمانی) و لەوێوە بۆ (تۆبزاوای کەرکوك) کەلەوێ گەنجەکان بەژن و منداڵەوە ئەنفال دەکرێن و ئەویش لەگەڵ هاوولاتیەکی تری سەرگەڵو بەناوی (ئاوڕەحمانی فەرەجی) ٦٠ — ٧٠ ساڵ، دەبرێن بۆ گرتوخانەی (نوگرە سەلمان) کەدوای حەوت مانگ ئازاد دەکرێن، جا دایکم بۆی دەگێڕاینەوە ئەوکاتەی لە (نوگرە سەلمان) بووین (حەمە جوجەی) سەرگەڵوشیان هێنا بۆ ئەوێ و ئێمەش بردمانە لای خۆمان،کەدیتمان قایشێکیان زۆر بەتوندی لەڕانی شەتەك بەستبوو بەهۆی ئەوەش کە ڕانەکەی شین و مۆر هەڵگەڕابوو دیاربوو ماوەیەکی زۆربوو ئەو قایشەی لێ بەسترابوو، وابوو من

سەمونم بەئاو وەك هەویر لێکردوو لەشوێنی قایشەکەم دا تا ڕانەکەی تەشەنە نەکات .

## گونیە لەبەر کردن لەسەردەمی ( شێخ عبدالکریم )دا نیشانەی نەفس شکاندن بووە

**گونیە لەبەر کردن کە لەسەردەمی (شێخ عبدالکریم) وەکو دەوترێ نیشانەی نەفس شکاندن بووە، لەپەرتوکی (ئاوڕدانەوەیەك لەبزوتنەوەی هەقە – مستەفا عەسکەری) لە لاپەڕە(٢٥) دا هاتووە:** کە لەساڵی (١٩٣٤) حکومەتی پاشایەتی عیراق (شێخ عبدالکریم) ی گرت و بە دەست بەسەری لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر لەناسراوانی هەقەدا لە (کەرکوك) داینا چەند کەسێکیشی لێ دوور خستنەوە بۆ (حەویجە). مریدەکانی(شێخ عبدالکریم) کە بەمە دەزانن زۆربەیان لەحاڵی ئاسایی دەردەچن و جلو بەرگی خۆیان لەبەریان دادەماڵن و دەیسوتێنن و گونیە لەبەر دەکەن و ڕوو دەکەنە (کەرکوك) .

**(مەلا سەلامی ترێ خۆر) لەدیدارەکەیدا لەگەڵ (شێخ ستار لە لاپەڕە(٢٧) دا دەڵێ:** ژنان لەم گونیە لەبەرکردنەدا بەشدار نەبوون و هەر جلو بەرگی خۆیان لەبەردا بووە، بەوتەی (محمدی مەلا کەریم) لە لاپەڕاوێزی (٢٨) و لە لاپەڕە (٢٧)دا: ئەم ساڵە لەناوچەکەدا بەساڵی (گونیە) ناوبانگی دەرکرد یەکێك لەوانەی لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر لەموریدەکاندا چوون بۆ(کەرکوك) مەلا صالحی عەسکەری بوو کەئێستا لەمزگەوتی گەورەی کۆیە مەلایە ئەم گونیە لەبەر کردنە جۆرە پێڕەویەك بوو لە (ئەهلی تەصەووفی کۆن) کە بەرگی (خوری) یان لەبەر دەکردوو دەستیان لەدنیا دەشت و گوێیان بەجلو بەرگ و خۆراك نەدەداو خەریکی خواپەرستی بوون .*

## زاراوەکانی ( سەرتەکیە، براسەیار، موخلیس، مونکیر ) لەکاتی بزووتنەوەی هەقەدا چی بوون ؟

– **سەرتەکیە:** لەهەر گوندێك کە هەقەی تێدا بوون یەکێکیان بەسەر تەکیە هەڵبژاردووە، جیاوازیش نەبووە لە نێوان ئەوە کە سەرتەکیەکە پیاوبێت یاخود ژن.(پەڕتووکی ئاوڕدانەوەیەك لە بزوتنەوەی حەقە، لاپەڕە٥٢)

**٢– براسەیار: لەپەڕتوکی ئاوڕدانەوەیەك لە بزتنەوەی هەقە – مستەفا عەسکەری) لە لاپەڕە (٤٨)دا هاتووە:** لەسەرەتای دەسپێکردنی بزوتنەوەی هەقەدا هەندێ لە موریدەکانی شێخ عبدالکریم بەهۆی جەزبە لێهاتنەوە دەستبەرداری کارو کاسبی بوون و وازیان لەژن و منداڵیان هێنا، ئەمانە کەوتبوونە گەڕان بەناو دێهاتەکاندا لەبارەی سوفیەتی و هەق پەرستی و تەریقەتەوە بۆ خەڵك دەدوان، کە (مامە ڕەزا – بوو بە سەرکردەی حەقە ئەم تاقمەی کرد بە نوێنەری خۆی بۆناو حەقەکان هەردووکەس بەیەکەوە دیناردن بۆ بڵاوکردنەوەی ڕێوشوێنی حەقەیەتی بەهەرکام لەو پیاوانە دەوترا (براسەیار = براگەڕۆك)

**لەپەراوێزی ژمارەی یەکی ئەم بابەتەش هاتووە لە لاپەڕە(٤٩)دا (مامۆستا همزە عبدالله)دەڵێت:** یەکەمجار حەمەسور ئەو ڕێبازەی دانا بۆ هەندێ لە حەقەکان کەکارنەکەن تا بەدێهاتەکاندا بگەڕێن بۆ ئامۆژگاری و خەڵك ڕاکێشان و پڕوپاگەندەکردن، **(محمدی مەلا کەریم)یش لەو نێوەدا دەڵێت:** ئەم شێوەی بانگ ڕاهێڵ ناردنە بەملا و بەولادا بۆ ڕێخۆشکردن و بیرو باوەڕ بڵاوکردنەوە لە کۆنەوە لەزۆر بزوتنەوەی ناو مسوڵماندا بووەو کاری خۆی کردوە، کە ئەمەش نیشانەی کەڵك وەرگرتنی پێشەوایانی حەقەکانە لە شێوەو ڕێبازی پێشینان.

* بەوتەی بەڕێز (شێخ هاوڕێ کاکە حەمە مامە ڕەزا) ساڵی ١٩٣٤ کاتێك شێخ عەبدولکەریمی شەدەڵە دەستگیر کراوە هەریەك لەمامە ڕەزا و حاجی شێخ عارفی سەر گەڵوو یشی لەگە لێدا دەگیرێن کە ئەو دووانە ماوەی شەش مانگ بۆ حەویجە دور دەخرێنەوە بەڵام شێخ عەبدولکەریم هەر لە خانەقاکەی کەرکوك دەست بەسەر دەبێت.

**٣- موخلیص: هەر لە پەڕتوکی (ئاوردانەوەیەك لە بزوتنەوەی حەقە، لاپەڕە(٤٨) - مستەفا عەسکەری)دا هاتووە:** ئەگەر کەسێکیش بەدڵ لەگەڵیاندا بووبێت بانەش بووبێت بە حەقە پێی وتراوە (موخلیص) و وەك خۆیان مامەڵەیان لەگەڵداکردوە .

**٤-مونکیر:** حەقەکان بەو کەسانە ی کەنەبووبون بەحەقە پێیان دەوتن (مونکیر).

**بۆچی ( هەقەکان ) بەتەقەی هەرشتێك ودەست لەکەلەکەدان هەڵچوون و تورە بوون ؟**

**لەپەڕتوکی (ئاوردانەوەیەك لە بزووتنەوەی هەقە- مستەفا عەسکەری)لە لاپەڕە (٢٢) لە پەراوێزی (٢١)دا لەزمانی (شێخ حسێنی خانەقا) گوتراوە:** وشەی (هەقە) بەجۆرێك کاری تێکردبوون هەر تەقەیەکیان بەرگوێ بکەوتایە ڕاچەنینایە هاواریان دەکرد (یا حق) کە بەشێکی زۆری ناوی هەقەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەمە، ئێمەش لە ژمارە (٥٠)ی (گۆڤاری شمشارە)دا لەبەواداچونماندا سەبارەت بەو بابەتە دەڵێین: دیارە هەقەکان بەدەنگی تەقەی هەرشتێك و دەست لەکەلەکەدان هەڵچوون و هەرچی قسەو جنێوێکیش بەزاریاندا هاتبێ لەوکاتەدا نەیان گەڕاندۆتەوەو دەریان بڕیوە، هەروەها خەڵکی جیا لەهەقەش زۆرجار بە ئەنقەست دەنگیان لە تەنەکە هێناوە بۆئەوەی هەقەکان پێی تورە ببن و هەڵبچن هەروەکو سوعبەت کردن، لەوبارەوەش (خاتو ئایشە) لەدایکبووی (١٩٢٥)ی گوندی (گەڵنێری) کەئێستاکە لە(بەکرەجۆ) نیشتەجێیە پێمانی ووت: (لەبەرئەوە ئێمە هەمیشە دڵمان بەیادی خواوە بەندە بۆیە بەدەنگی تەقەی هەرشتێك دڵمان ڕادەچەنێ) .

(ئەحە جوندی گەڵنێری) کەئێستاکە لە (بەکرەجۆ) دەژی هەموو خەڵکی شارۆچکەکە دەزانن کەبەدەنگی تەقەی هەرشتێك و دەست لەکەلەکە دانی تورە دەبێ و وەکو خۆی دەیوت: بەدەست خۆم نیە هەرچی بەزمانمدابێت نایگێڕمەوە .

**دیاردەکانی ( چرا پف، شەوەڕەشە، زگە ڕووتە ) چی بوون و ئایا لەناو هەقەکاندا بوونیان هەبووە ؟**

ناحەزانی حەقە تاکو ئێستاکەش زاراوەکانی (چرا پف و شەوە ڕەشە و زگە ڕووتە) دەخەنە پاڵ هەقەکان، سەرەتا بابزانین ئەم زاراوانە واتای چیان بەخشیوە:

**چرا پف، شەوەڕەشە، زگەڕووتە:** گوایە حەقەکان بەشەوان لەماڵێ کۆبوونەتەوەو دوای گێڕانەوەی قسە و بەسەرهاتی خۆش و پێکەنین یەکێکیان لە پڕ فوی لە چرای ژورەکە کردووە و بووە بە **شەوەڕەشە** و لە تاریکایی ئەم بارەدا ژن و پیاوەکانی ژورەکە بێ ئەوەی گوێ بەوە بدەن کە هاوسەری شەرعی یەکترن واتا ژن و مێردی یەکتر بن دەستیان کردوە بە کاری سێکسی لەگەڵ یەکتر. یان ژنەکان دەرپێیەکانیان لەگۆشەیەکی ژورەکە داناوەو کاتێك چراکەیان کوژاندۆتەوە هەریەك لە پیاوەکان دەستیان داوەت یەکێ لەو دەرپێیانە و بێ ئەوەی گوێ بەوە بدەن کە دەرپێی هاوسەری شەرعی خۆیەتی لەگەڵ خاوەنەکەیدا کارێکی سێکسیان ئەنجام داوە.

**زگەڕووتە**ش بریتی بووە لەوە شەوانە پیاوو ئافرەتەکانی حەقە کە لە ژورێ کۆبوونەوەو جەزبەو حاڵ گرتوونی زگیان ڕووت کردووە، ژنەکان لەلایەکی ژوورەکەو پیاوەکانیش لەلایەکەی تری ژوورەکە بەرانبەر یەك بەرەو ڕووی یەکتر هاتوون و ژنەکان گوتویانە (ئاگرم گرتووە لەبنەوە)، پیاوەکانیش گوتویانە: (سەلکە جونی بەمنەوە)،

(سەلکە جونی) واتە دەسکە سندۆڵ، ئەم گێڕانەویەشمان لە کاك (ع، ع، ع) کە نەیویست ناوی تەواوی بنوسین بیست کە ووتی: لەساڵی ١٩٩٢ لەگەڵ ژمارەیەك لەڕۆشنبیرانی (بزووتنەوەی ئیسلامی کوردستان) لە (ڕانیە)وە بەسەردان چووینە لای (مام رۆستەم حەوێزی) کەشاعیرێکی میللی (کۆیە) بوو، لەمیانەی قسەو باس لەبارەی ئایینی ئیسلام، ئەم بەسەرهاتەی هەقەکانی بۆ گێڕاینەوەو دەیوت: ئەوکاتەی کەمندالێ بووین بەشەوان لەکولانکەی سەربانەوە سەیری هەقەکانمان دەکرد، کە لەژوورەوە شوغڵەیان دەکرد ئەم شتەیان دەکردوو دەوتەوە. دەشوترێ هەرپیاوێك بەشداری ئەوەی کردبایە دەبوایە ژنی خۆی یان خوشکێکی یان کچێکی خۆیشی بردبایە.

دیارە ئێمە لە بەدواداچونماندا بۆ ڕاستی و دروستی ئەم بابەتە کە لەناو حەقەکاندا بوونی هەبووبێ یان نا، هەریەك لە بەڕێزان (کاك شێخ هاورێ کاکە حەمە مامە ڕەزا) و (کاك شێخ محمود کاکە حەمە شێخ عەبدولکریم) و چەند بەساڵاچوێکی ژن و پیاوی حەقەش لەناوچەکان زۆر بەتوندی نکۆڵیان لە شتی لەمجۆرە دەکرد و بە پڕوپاگەندەیەکی بازاڕیان دادەنا و هەروەها بەڵگەشیان بۆئەوە ئەوەبوو کە لەنێو حەقەکاندا دووکات بۆ زیکر هەبووە کە بەیانیان و ئێواران بووەو پیاوو ژن بە جیا لە شوێنی یەکتر زیکری بێ دەنگیان ئەنجامداوە کەدەبوایە بەرماڵێك یان چارۆگەیەك بەسەر سەری خۆیاندا بدەن و بەبێ دەنگی یادی خوا بکەنەوە بەمەش وتراوە (شوغڵە).

دیارە ئەم تۆمەتی کاری سێکسی دانە پاڵ حەقەکان بەهەرەمەکی لە مێژووداو لە ئێستاشدا هەمیشە دەسەلاتدارانی ڕۆژو و توێژە مشەخۆرەکۆمەلایەتیەکانی کۆمەڵگەی مسوڵمانان داویانەتە پاڵ هەر بزوتنەوەیەکی تازە کەسەری هەڵدابێ . **لەپەرتوکی (فەلسەفەو ڕامانی یارسایی – لەفەرهەنگ و کۆمەڵگەی کوردەواریدا – جەمال نەبەز) دا هاتووە دەڵێ:** دووبارەکردنەوەی درۆ و بوختانی دوژمنانی کورد لەلایەن (شێخ رەزای تاڵەبانیە)وە کە گوایە (یارسانیەکان – کاکەییەکان)شەوەڕەشەیەکیان هەیە و بە ئاوو تاوەوە دەیگێڕێتەوە، دەشڵێ: بیستومە (نەك دیتومە). ئەم بوختانی شەوەڕەشە بە (ئێزیدییەکان و عەلەوییەکان)یش دەکرێ و گوایە: ژنان و پیاوان کۆدەبنەوەو مۆمێك دادەگیرسێنن و کەلەشێرێك دەهێنن کە هێندە تەنگە تاوی دەکەن دەکەوێ بەسەر مۆمەکەداو مۆمەکە دەکوژێتەوەو ئەوجار لەپاڵ تاریکیدا دەکەونە یەکدی و پاش ئەوە گوناهەکەی دەهێنن بەسەر کەلەشێرەکەدا و سەری دەبڕن. ئەم بوختانە بە (شەبەکەکان و بەهائیەکان و سارەیی و یاجوانی و حەقەش)دەکرێ بەلاَم بە گێڕانەوەی جیاواز. ئی (بەهائیەکان) گوایە لە کۆبونەوەیەکدا (خورما) یەك دەبەشنەوە کە پێی دەڵێن (خورمای بابی) ئەوەی ئەو خورماییەی خوارد کەیفی هەڵدەستێ و سەرخۆش دەبێ و بەوجۆرە ژن و پیاوەکان دەکەونە کار. دیارە ئەم تۆمەتی ئەنجامدانی کاری سێکسی ناشەرعی لەنێوان ژن و پیاو هەمیشە لەلایەن داگیرکەرانی کوردستان دراوەتە پاڵ لایەنەکانی شۆڕشی کوردیش. بە نمونە لەساڵی شەستەکان کە (شۆرشی ئەیلول) لە ئارادا بووە باوکم (ملا محمدی نورەدینی) دەیگێڕایەوە: کە بنەماڵەیەك لە (سمایل عوزێرییەکانی شوان) پاڵیان دابووە حکومەتی عێراقی ئەوکات و ببوونە چەکداری کە جاشیان پێدەوترا. ڕادیۆی کوردی بەغدا لەوکاتەدا هەڵدەستێ بە چاو پێکەوتنیان و ڕاستەوخۆش بلاَوکراوەتەوە، بێژەرەکە پێش یەکێکیان

دەکەوێت و پرسیاری لێ دەکات و دەڵێت: گوایە چەکدارەکانی (مەلا مستەفا بارزانی)واتە پێشمەرگە کە دەچنە گوندەکان تەعدای ناموس لەخەڵکی دەکەن و دزی دەکەن و بەزۆر پارە لەخەڵك دەستێنن، ئەو کەسەی کە چاوەڕوانی لێکراوە کە بەئارەزووی بێژەرەکە بڵێ وایە، دیارە کەسێکی ڕاستگۆ بووەو وتویەتی: وڵڵاهی باوکم ئەو شتانەم لێنەدیون. هەروەها لە ساڵی هەشتایەکانیش ڕژێمی (بەعس)یش بوختانی لەوجۆرەی بۆ (کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان) هەڵدەبەست، لە ئێرانیش بوختانی لەوجۆرە بۆ (کۆمەڵەی زەحمەتکێشانی کوردستانی ئێران) هەڵدەبەسترا. حکومەتی تورکیاش بوختانی لەوجۆرەی بە (پارتی کرێکارانی کوردستان –p.k.k)کردووە هەروەها لەشەڕی براکوژی و ناوخۆی کوردستانیش لایەنە نەتەوەییەکان بوختانی لەوجۆرەیان بە شیوعی و کۆمەنیستەکان و ئیسلامیەکان دەکرد بە پێچەوانەشەوە.

**هەروەها لەپەڕتوکی (بۆ لەهەقە کەوتنە تەقە ؟)لە لاپەڕە(٣٤) نوسینی (ڕەئوف محمد زوهدی) دا هاتووەو دەڵێ:**
بێگومان ئەو بەرەڵاییەی کە دەدرایە پاڵ هەقەکان لەبابەت تەگەو بەرانیەوە لەوەوەیە کەئافرەتی هەقەکان سەربەست ترن بوون لەئافرەتی کۆمەڵگە فراوانەکەی کەتیایدا دەژیان، سنوری کۆمەڵایەتی ئەمان لەهی ئەوان تۆزێك پان و بەرین تر بوو، هەندێك کۆت و بەند کە لەکۆمەڵگە فراوانەکەدا کە بەسەر ئافرەتەوە هەبوو لەچارەنوس و شوکردنیدا هەقەکان نەیان دەسەلماندو دانیان پێدا نەدەنا، وەکو (شیربایی و سورانە) .
لە لاپەڕە (٣٩) شدا دەڵێت: لەبابەت ئافرەتەوە هەقەکان هیچ نەریت پەیڕەوێکی ئەوتۆیان نەبووە کەتایبەتی بێت بەخۆیان و لەکۆمەڵگەکەی کەتیایدا دەژین جیایان بکاتەوە. بێ پرسی مەلاو بێ ئاگاداری ئەم هیچ پیاوێ: نەبووە بەمێردی هیچ ژنێ:، وەهیچ ئافرەتێکیش نەبووە بەژنی هیچ پیاوێك تا هەردوولا لەبەرچاوی مەلاو دوو شایەت خۆیان (تەقلیدی مەزهەبی ئیمامی شافیعی) نەکردبێت نەبوون بەژن و مێرد .
**(سی جی ئەدمۆنس) لە پەڕتوکەکەیدا بەناونیشانی (کورد تورك و عەرەب)لە لاپەڕە(٥٧)دا نوسیویەتی:** گوایە لەمەفرەزەیەکی پۆلیسەوە بیستویەتی کەچوون بۆ (هەڵەدن) بۆ تەبلیغات و ڕاگەیاندن، کە لەوسەرەوە گەڕاونەتەوە بە (سەرگەڵو)دا هەقەکانیان دیوە بەگەلە، بەنێر و مێ وە لەحەوزی مزگەوتدا سەگیشان پێ بووە مەلەیان کردووە .
هەروەها لە لاپەڕە(٨٧) نوسیویەتی: لەناو هەقەکان جۆرێك لەکۆمەنیستی ماڵ و موڵك و ئافرەتی تێدا بەدی دەکرێت .

لەبەدواداچوونی ئێمەش لە گۆڤاری ژمارە (٥٠)ی (شمشارە) (حاجی علی حاجی سمایلی علی – لەدایکبووی ساڵی ١٩١٩ مەلا سەفی مەرگە)، لەوبارەوە وتی: ئەوکاتی کەتەمەنم هەر گەنج بوو بەردەوامیش هاتوچۆی شەدەڵەو کەلکەسماقم دەکرد، ئەو بوختان و قسانە دەکران، منیش بۆ درۆو ڕاستی ئەم شتانە وەکو جاسوس جاسوسیم بەسەرەوە دەکردن کەجیا لەچاکە شتێکی خراپم لێ نەدەدیتن . لەدێیەکەی خۆشمان لەنێو هەقەکان زکرێك هەبوو کەپێی دەوترا (سەد خەتم) کەوا خەلیفە (شێخ عمر سەرگەڵوێی) لەژووری مزگەوتی (مەلا سەفی)

بەمریدەکانی دەکرد، کە هەر پیاوانیش بەشداربوون، لەبەرئەوەش کەمندالّ بووین ڕێگەیان بەئێمە نەدەدا کەبچینە لایان بەلاّم لەژوورەوە هەر گرمەو دەنگی زکریان دەهات .

## باری ئاسایش و ئـارامـی و تەبایی هـەقـەکـان:

**هەر لەپەرتوکی (ئاوڕدانەوەیەك لەبزووتنەوەی هەقە – مستەفا عەسکەری)دا هاتووە:** مامۆستا (جەمال بابان)یش کەماوەیەك بەڕێوەبەری ناحیەی ناوچەی (میرزا رۆستەم) بووە لەژمارە (٢٣٣٤)ی ڕۆژنامەی (العراق) کە لە ١٩٨٣/١٠/٥ دا دەرچووە نوسیویەتی و دەڵێ: ئەوماوەیە کە لەوناوچەیەدا بووم جارێك نەمبیست شەڕ یان هەرایەك لەناو هەقەکاندا ڕوویدات یان خەرمانێك یان خانویەك بسوتێ یان دزی ماڵ و ئاژەڵ بکرێ، یاخۆ ژن هەڵبگیرێ کەئەوانە لەدێهاتەکانی تردا ئەو ڕۆژە ڕەمەکی بوون، زوو زوو دوپات دەبونەوە، تاکە ڕۆژێك نەمدی یەکێ لەدانیشتوانی دێهاتی هەقەکان بێ لەپۆلیسخانە لای مودیری ناوچە سکالاّ لەیەکتر بکەن یاخۆ یەکێك سکالاّیان لێ بکات، هەر بەقەستی چاوەڕوانی شتێکی وام دەکرد ئێستاش نەمدی .

**هەروەها (مامۆستا جەمال بابان) لەپەرتوکی (یاداشتنامەی ژیانم) ساڵی ٢٠٠٧ نوسیویەتی و دەڵێ:** ئەوساڵ و چەند مانگەی لەوناوەدا بووم لەهەقە دێیەکان ڕۆژێك تاوانێك ڕووینەدا، نەهاتنە پۆلیسخانە سکالاّیەك بکەن یان یەکێك سکالاّیان لێبکات، دەست درێژیان نەدەکردە سەر موڵك و ماڵی کەس، بەپێچەوانەوە کۆمەڵێکی بەڕێزو سالارو خاوەنی کردەوەی جوان بوون، لەمیانەی لێکۆڵینەوەمدا لێم دەبیستن دەیانگوت: بەرانبەر بەئافرەتی بێگانە (واتە جگە لەژنی خۆیان) هەرگیز پیاوەتیان نامێنێ، واتە بەنەخوێنی حەرام ناکەنەوە، بۆیە دەبێ ئەو بیرو ڕا ناشیرین و ناهەموارانە دوور بخرێتەوە کەهەندێ قسەی نابەجێ و ناحەق بەتایبەت لەبارەی ڕەوشتەوە دەدرێتە پاڵیان .

## کۆچی دوایی کردنەکەی ( شێخ عبدالکریم شەدەڵە ):

تاکو ئێستاکە وازانراوە (شێخ عبدالکریمی شەدەڵە) بەهۆی برینی پێی کۆچی دوایی کردووە کەوا کاتێ لەنوێژی بەیانی گەڕاوەتەوە ماڵ نەناسراوێك بەردێکی کێشاوە بەپێیداو برینداری کردووەو هەر بەو برینەش دوای ٤٠ ڕۆژ کۆچی دوایی کردووە. لە بەدواداچوونی ئێمە لە ژمارە (٥٠ی گۆڤاری شمشارە) لەسەر زاری بەڕێز (کاك محمد علی مەلا سەفی) بیستمان کە برینەکەی پێی شێخ عبدالکریم لەئەنجامی پێداکێشانی بەرد نەبووە، بەڵکو بەهۆی بەرکەوتنی گوللەی تفەنگ بووە، ئەویش وەك بەڕێزیان گوتی: من لەزمانی مریدەکانی شێخ عبدالکریم بیستومە کەوا (صۆفی عەلیە شەلی صۆفیانی) پزیشکی میللی و تایبەتی شێخ عبدالکریم گوتویەتی: کەچوم بۆ چارەسەر کردنی برینەکەی شێخ عبدالکریم فەرمویەتی: ئەوە برینی سەگە، منیش پێم وتوە: قوربان برینی سەگ نیە بەڵکو برینی تفەنگە، شێخ عبدالکریمیش فەرموویەتی: صۆفی عەلی برینی سەگە ئەگەر کابرا سەگ نەبوایە من کە لەنوێژی بەیانی گەڕاومەتەوە بۆ دێت ڕێگەم پێ دەگرێت، بەلاّم باسی مەکە با دوژمنایەتی بۆ منداڵ و نەوەکانم بەجێ نەمێنێ . جێی ئاماژە پێکردنیشە ئەو کەسە کە تەقەی لە شێخ عبدالکریم کردووە کەسێکی ناسراوی سنورەکە بووە .

## چارەنوسی بزووتنەوەی هەقە دوای کۆچی دوایی کردنی ( شێخ عبدالکریم )

**لەپەڕتوکی (ئاوڕدانەوەیەك لەبزووتنەوەی هەقە لە لاپەڕە (٣٠)دا مستەفا عەسکەری) دا هاتووە کە:**

١-بەشێك لەموریدەکان هەروەك صۆفیگەلێکی سادە مانەوەو هاتوچۆی شەدەڵەیان دەکرد، ئەوانە زۆرتر سەر بەکوڕانی شێخ عبدالکریم بوون .

٣-بەشێکی تر سەر بەسەرۆکایەتی شێخ عەبدوڵڵای کوڕی حاجی شێخ مستەفای شێخ مستەفای عەسکەربوون کە براگەورەی شێخ عەبدولکەریم بوو، سەری هەڵدا ئەمانیش ژمارەیان کەم بوو، زۆرتریان کوڕە شێخ بوون و هەر زوو دەستیان لەوکارە هەڵگرت، ئەگەرچی بەتەواویش تێکەڵی کۆمەڵەی مامەڕەزا نەبوون .

٤-بەشێکیان دوای حەمەسور کەوتن و لە (کلاوقوت) نیشتەجێ بوون .

٥-بەشی زۆریش ڕوویان کردە مامەڕەزای برای شێخ عەبدولکەریم، پاش ئەوەی بەشی دووەم و سێیەم کشانەوە بەشی پێنجەم واتە ئەمانەی دوای مامەڕەزا کەوتبوون پەرەی سەندوو بوو بەکۆمەڵەی سەرەکی، تاقمی حەمەسوریش هەر ئەوەندە مانەوە کە لەگوندی (کلاوقوت) بوون. نەیاندەهێشت منداڵیان ببێت . خەریکی کارو کاسبی و کشتوکاڵ و هۆنینەوەو بڕۆشتنی تەزبیحی قەزوان بوون، بیانوی حەمەسور بۆ نەهیشتنی منداڵبوون ئەوەبوو گوایە: منداڵ خراپە چونکە خوا لەقورئاندا فەرموویەتی : (وَاعْلَمُوا أَنَّمَا أَمْوَالُكُمْ وَأَوْلَادُكُمْ فِتْنَةٌ وَأَنَّ اللَّهَ عِندَهُ أَجْرٌ عَظِيمٌ). (سوره الأنفال)، ئایەتی ٢٨) و چەندین ئایەتی تریش .

سەرنج/ لێرەدا پێویستە ئاماژە بەوە بکەین کەجیا لەو ئاماژە پێکردنەی بەڕێز (مستەفا عەسکەری) بە حەماغای پشدەر تائێستاکە جیا لەئێمە لە ژ (٥٠- گۆڤاری شمشارە) هیچ زانیاریەك و بەدواداچونێك چ بۆ حەماغای پشدەر و چ بۆ باڵەکەی نەبوو وە نەکرابوو.

## بەشـــی سێـــیەم " سـێ بـاڵە سەرەکیەکەی هەقە

یەکەم/ بـاڵی مامە ڕەزایی- کەڵکە سماق ی دوکـان.

دووەم/ بـاڵی حەمەسووریی- کلاوقوت ی چەمچەماڵ.

سێیەم/ بـاڵی حەماغایی هەنـارۆك ی پشدەر.

# مامە ڕەزا و مامە ڕەزاییەکان

١- بـــــالـــــی مـــــامـــــە ڕەزایـــــی
٢- مـامـە ڕەزا و مــامــەڕەزایـــیــەکان
٣- بەشێك لەمێژووی گوندی کەڵکە سماق مەڵبەندی مامە ڕەزاییەکان.
٤- هاتنی مامە ڕەزاییەکان بۆ کەڵکە سماق.
٥- نەریتی پەیڕەوکانی مامەڕزایی.
٦- کەسێتی مامەڕەزا.
٧- ڕاو بۆ چونی مامەڕەزا لەبارەی بەرپاکردنی شورشی چەکداری.
٨- دارە قوڵەی مامە ڕەزاییەکان چی بووە؟!.
٩- دارە قوڵەی مامەڕزاییەکان هێمای بەرگری ئاشتیانە بووە.
١٠- مەبەست لەدروشمی یاکەریم یاڕەزای مامە ڕەزاییەکان.
١١- مامە ڕەزاییەکان ژنیان لەدادگای دەوڵەتیی مارەنەکردووە.
١٢- وەسێتێکی مامە ڕەزا.
١٣- دوای کۆچی دواییکردنی مامە ڕەزا
١٤- کاکە حەمەی مامە ڕەزا میوانداری حەمەسووری ڕەتکردۆتەوە.
١٥- دەگوترێت: تەنیا کەڵکە سماق لەسەردەمی عەبدولکەریم قاسم لەبۆردومانی فڕۆکە پارێزراو بووە.
١٦- ناوی خوشك و برا هەقەکانی خانەقاکەی کەڵکە سماق.
١٧- بەشداری مامە ڕزاییەکان لە شۆڕشەکانی کورد.
١٨- چارەنووسی باڵی مامە ڕەزایی.

## مـامـه ڕەزا و مـــامـــەڕەزایـــیـــەكان

(مامەڕەزا) لەساڵی ١٩٠٥ لە(گوندی شەدەڵە) لەدایكبووە و لەڕۆژی ١٩٦١/٢/٢٥ لە (سلێمانی) كۆچی دوایی كردووەو لەشەدەڵەش بەخاك سپێردراوە .

دوای كۆچی دوایی شێخ عبدالكریم (مامە ڕەزا) كەبرای شێخ عبدالكریمی شەدەڵە بووە هەڵدەستێ بەدانانی هەشت خاڵ بۆ ڕێكخستنەوەی (هەقە) جەماوەری زیاتری هەقەكان دوای ئەو دەكەون كە بە (مامە ڕەزایی) دەناسرێن، لەساڵی (١٩٦١) كەمامەڕەزا كۆچی دوایی دەكات (كاكەحەمەی) كوڕی شوێنی دەگرێتەوە كەناوبراویش لەساڵی ١٩٩٧ كۆچی دوایی كردووە، كوڕە گەورەكەی بەناوی (شێخ هاوڕێ) جێنشینایەتی مامە ڕەزاییەكانی گرتۆتە دەست.

**بــەشێـك لـەمێـژووی گـونـدی (كەڵـكـە سـمـاق) نـاوەندی مامە ڕەزاییەكان:**

سەبارەت بە بەشێك لەمێژووی گوندی (كەڵكە سماق) بەڕێز كاك (شێخ هاوڕێ كاكە حەمە مامە ڕەزا) لەوەڵامی پرسیارەكانماندا وتی:

ناوەكەی: سێ بۆچوون هەیە:

١- ڕایەك دەڵێ: لە وشەكانی (كەڵك) كەواتای سود بەخشین دەبەخشێ و وشەی (سماق) واتە (ترش) كە بەو پێیەش ماناكەی دەبێتە (سودی سماق) كەدیارە لەبوونی ڕووەكی (سماق) كە لەشوێن و سنوری گوندەكە بووە سەرچاوەی گرتووە. ٢- ڕایەكی تر هەیە لەو باوەڕدایە كە لەوشەی (كەڵك) كە باڵندەیەكی گەورەی ئاویەو ڕەنگیشی سپیە سەرچاوەی گرتووە كە بەوپێیەش دەبێتە (سماقی سپی) .

٣- ڕایەكیش دەڵێ: لەوشەی (كەڵك) كەواتای شوێنێكی بەرز دەبەخشێ وەكو (كەڵك)ی كوڕكوڕی (كانیتوی مەرگە) سەرچاوەی گرتووە ئەویش بەهۆی بەرزی شوێنی گوندەكە كەڕووەكی سماقیشی هەبووە.

**بەرەبابەكانی گوندەكە:**

بریتین لە: (مامە ڕەزاییەكان) واتە شێخەكان، (مام فەرەج لەهۆزی جاف)، (مەلا حامیدە ڕەش)، (كوێخا سمایل/ كە گـەلاڵی شـینكایەتیان پێـدەڵێن، بـەرەبابێكی تـریش كەنزیكـەی (١٥٠) سـاڵێك بـەر لەئێسـتا لە(دارەشمانـەی پشدەر)ەوە یەكەمجار هاتونەتە گوندی (بێ ماوا)ی دوكان و دواتر لە (كەلكە سماق) نیشتەجێ بـوون، هـەروەها بنەماڵەو تیرو هۆزی تریش لەگوندەكە هەن .

- ئەسیری شەڕی (عـیراق - ئـیران) (محمـود حسـن) لـەدایكبووی ١٩٥٧ كـە سـەرباز دەبـێ لەسـاڵی ١٩٨١ ەوە ئەسیری شەڕ بووە لەئێران ئێستاكە لەژیاندا نەماوە .

**چۆڵكردنی گوندەكە:**

یەكەمجار - لە مانگی ١٩٦٣/٦ بەهۆی تۆپبارانكردنی گوندەكە لەلایەن ڕژێمەكەی عبدوالسلام عارف .

دووەم جار - لەساڵی ١٩٦٤ لە ترسی حەرەس قەومیەكان .

سێ یەم جار - ساڵی ١٩٦٥ .

چوارەم جار - لە ١٩٨٨/١٠/٢٢ لە ترسی ڕژێمەكەی صدام حسێن.

## هاتنی مامە ڕەزاییەکان بۆ (کەڵکەسماق)

وەکو بەڕێز (شێخ هاوڕێ کاکە حەمە مامە ڕەزا) کە ساڵی ١٩٥٩ لە (کەڵکە سماق) لەدایك بووەو ساڵی ١٩٧٦ یش لەگەڵ (شەمسە حەمە تاهیر کەرکوکی) ژیانی هاوسەری پێکهێناوە کەباوکی هەقە بووە باسی کرد و گوتی: مامە ڕەزا خۆی لەسەرەتای بیستەکانی سەدەی ڕابردوو لەگەڵ سێ لەمریدەکانی بەناوەکانی (شێخ محمدأمینی مەڵحە / ڕاوێژکاری مامە ڕەزا، شێخ عارفی إلآألله ی دەشتی کۆیە، مستەفای مەلای إلآالله ی دەشتی کۆیە) هاتووە بۆ کەڵکەسماق کە ئەوکات مامە ڕەزا خانوو خانەقای لە (کەڵکەسماق) هەبووە چونکە پێش مامە ڕەزا خەڵکی (کەڵکەسماق)زەوی و زارو ئاویان پێشکەش بە (حاجی شێخ مستەفا) ی باپیری مامە ڕەزا کردبوو، ئیتر بەهاوکاری خەڵکی گوندەکە یەکەمجار مزگەوت و حوجرەو خانووی مەلا دروست دەکات و ئەوکات ژوورێکی مزگەوتەکە تەرخانکراوە بۆ موریدەکانی مامە ڕەزا، دوای چەند ساڵێکی کەم خانوی ماڵی مامە ڕەزا و خانەقاکەش دروست دەکرێن، ساڵی ١٩٦٣ کاکە حەمەی مامە ڕەزای باوکم لەترسی بارودۆخی شەڕی نێوان شۆڕشی ئەیلول و حکومەتی عیراقی ماڵەکەی لەکەڵکەسماقەوە دەباتە پشتی شاخی (هەنگە ژاڵ)، لەساڵی ١٩٦٤ یش کە حەرەس قەومیەکان دێنە سنورەکە زستانەکەی ماڵی دەچێتە (خۆشاوی مەرگە) دوای ماوەیەك لەشەڕ وەستانەکەی ١٠ ی شوباتی ١٩٦٤ دەگەڕێتەوە کەڵکەسماق، ساڵی ١٩٦٥ – ١٩٦٦ ناچار ماڵمان بردە (گوندی تۆربە)ی بناری کۆسرەت، ساڵی ١٩٦٨ یش دووجار ماڵمان بردە گوندی (مەلا سەفی مەرگە) لەپایزی ١٩٦٩ چوینە گوندی (تەنگژەی پشدەر) تاوەکو خوێندنەوەی (بەیاننامەی ١١ی ئازاری (١٩٧٠) کەئاشتی لەکوردستان هاتە کایەوە، ساڵی ١٩٧٤ یش کە شەڕ دەستی پێکردەوە یەکەمجار ماڵمان بردە گوندی (إلا الله) ی دەشتی کۆیە دواتر بۆ گوندی (کانی توی مەرگە) و تاکو نشوستی شۆڕشەکە لەساڵی ١٩٧٥، ساڵی ١٩٨٦ ماڵمان بردە دەشتی کۆیە بەری (قەلآسێوکە) کەماوەیەك لە گوندی (چوخلیجە)ماینەوە دواتر ڕۆشتینە گوندی (قوزلو) و جێگیر بوین و تا ساڵی ١٩٨٨ و بەهۆی پرۆسەی (ئەنفال)ی ڕژێمەکەی صدام دژ بەکورد ئاوارەی ئێران بووین تا ساڵی ١٩٩٠ گەڕاینەوە .

## نەریتی پەیڕەوەکانی مامەڕەزا :

* مامە ڕەزاییەکان بەیەکتریان دەوت خوشك و برا

* مامە ڕەزاییەکان ڕیشیان دەتراشی

* ژن و پیاوی مامەڕەزاییەکان لەخانەقای کەلکە سماق بەجیا کۆ دەبوونەوە .

* مامە ڕەزاییەکان چاو جگەرەیان تەرك نەکرد

* مامە ڕەزاییەکان لەکاتی سلاَو کردندا دەیان وت (یاکەریم یا ڕەزا) و لەکاتی تەوقە کردندا دەستی یەکتریشیان نەدەگوشی و تەنها سەری پەنجەکانیان بەیەك دەگەیاند .

* مریدە پیاوەکانی مامەڕەزایی کاکۆڵی پێشەوەی سەریان دەهێشتەوە .

## کـەسـێتـی مـامــەڕەزا

**لەپەڕتوکی (ئاوڕدانەوەیەك لەبزووتنەوەی هەقە لاپەڕە(٣٤) مستەفا عەسکەری)دا هاتووە:** مامـەڕەزا پیـاوێکی گـەنم ڕەنگ و بەشەوکەت بووە، مرۆیەکی لەسەرخۆو قسەخۆش و تێگەشتوو بووە، زمـانی عـەرەبی و فارسـی زانیـوە، لەئەدەبیاتی کوردی و فارسی دا شارەزایی هەبووە، تاڕادەیەکی باشیش ئاگاداری لەمێژووی گەلی کورد و گەلانی مسوڵماندا هەبووە، لەسەرەتای ژیایندا خوێندنی حوجرەی بووە، پیـاوێکی هاوچـەرخ و بـیرو بـاوەڕ پێشـکەوتوو بـووە، حـەزی بەچـاکەو پێشـکەوتنی کۆمەلاَیـەتیی گـەلی کـورد و چـینە چەوسـاوەکان کـردووە، لەگـەڵ پیـاوە دەرکەوتووەکانی کوردی سەردەمی خۆیدا پەیوەندی بەهێزو گفتوگۆی لەگەڵ زۆریاندا بووە بەتایبـەتی لـەماوەی دوور خستنەوەیدا بۆ (عەممارە)، پەیوەندیەکی پتەوی لەگەڵ (میر حاج)دا پەیدا کردووەو هەر ئەو پەیوەندیـەش بووە لەدواییـدا بـوو بەمایـەی پەیوەنـدی پەیـداکردنی هەقـەکان لەگـەڵ (کۆمـاری مهابـاد) دا، مامـە ڕەزا لەسـەر ڕێبازی (شێخ عبدالکریم) ڕۆیشتووە بەلاَم لەو زیاتر ڕووی کردوەتە خزمەتی کۆمەلاَیەتی کۆمـەڵی هەقـەی بـەرەو بیرو باوەڕی پێشکەوتنخوازی و نیشتیمان پەروەری بـردووە، پەیوەنـدی لەگـەڵ بزووتنـەوەی نەتـەوەیی کـورددا بەهێز بووە، لەسەردەمی کۆماری مهاباددا دەستەیەك لەهەقەکانی ناردووە بۆ مهاباد بۆ بەشداربوون لـەکاروباری کۆمارەکەدا ئەم دەستەیە بەسەرۆکایەتی (شێخ محمدأمینی مەڵحە) بـووەو پێکهـاتووە لـە (٤٠) کـەس کـە پێـنج کەسـیان خـەڵکی گونـدی (سـەرگەڵو) بـوون: شـەش کەسیشـیان خـەڵکی گونـدی (کوێرەکـانی) بـوون، پێـنج کەسیشیان خەڵکی (هەنجیرەی مەرگە) بوون، چوار کەسیشیان خـەڵکی گونـدی (خۆشـاوی) مەرگـە بـوون، سـێ کەسیشیان خەڵکی گوندی (کانی توو) بوون. کاتی گەڕانەوەی ئەو پۆلە هەقەیەی کۆماری مهاباد بـۆ کوردسـتان دوای لەناوچوونی کۆمارەکە (مەلا مستەفای بارزانی) کردبوو. نامەیەکی بۆ مامە ڕەزا ناردبوو ستایشی بەشداریی هەقەکانی لەکۆاری مهاباددا کردبوو، هەروەها سوپاسی مامەڕەزای کردبوو کەپشـتگیری شۆڕشـی بـارزانی سـاڵی (١٩٤٣ –١٩٤٤) کردبوو ڕۆڵی مامەڕەزای لەپشتگیری خەباتی گەلی کورددا بەرز نرخاندبوو بەداخەوە ئـەو نامەیـە فەوتاوە .. سەرنج ڕاکێشە ئەمە کە مامەڕەزا پیاوێکی ئاشتی خواز بووە هەقەکانیش چـەکیان هەڵنـەگرت بـەڵکو دارێکیان بەدەستەوە بوو لەجیاتی چەك، هەقـەکان هێـزو توندوتیـژیان بـەکار نـەهێنا هـەتا لـەڕێ ڕۆیشـتنەکەی

(داره قوڵه)شدا، مامه ڕەزا (بانگەوازی ستۆکهۆڵمی بۆ ئاشتی جیهـان) ئیمـزا کردبـوو، **(مامۆسـتا ڕەئـوف محمـد زوهدی) لەلاپەڕە (١٧٤)ی (بۆ لەهەقە کەوتنـە تەقـە)کـەی دا دەڵـێ:** پێشـکەوتنخوازان لێیـان ڕاپـەڕین لەشـاری (ستۆکهۆلم) دا (لەسوید) مافپەروەرانی دیموکراتی جیهان مانیفێستی ئاشتی و پاراستنی ئاشتی جیهانیـان ئیمـزا و بلاَو کـردەوە، کۆمـەلاَنی خـەلك لەڕۆشـنبیران و هونەرمەنـدان و پیـاو مـاقولاَن لـە ئـەوروپاو ئاسـیاو ئەفـەریقاو ئـەمریکا و ئوسـترالَیادا بەگـەرمی پێشـوازی ئـەو بەیاننامەیـەی ئاشـتیان کـردوو بناغـەی ئاشـتی نێودەوڵـەتیان دارڕشت، مامەڕەزا یەکێك بوو لەوانەی کە بەوپەڕی سـۆزەوە لـەم ڕێبـازەدا ڕێبـازی (ئاشـتی و پاراسـتنی ئاشـتی جیهان) وەکو شەخصیەتێکی ئاغرو دوور ئەندێش بەشدار بووەو تێکۆشاوە تەنانەت بۆ ئەم مەبەستە کەسـانێکی لەتاقمەکەی خۆی تەرخان کردووە وەکو (مەلا سابیری سۆفی محمد)، هەروەها پەیوەنـدی لەگـەڵ (بزووتنـەوەی نیشتیمانی) عیراقیشدا باش بووە لەمبارەیەوە بەڕێز **(عوسمان مستەفا خۆشناو) لەکتێبەکەیدا (گەلاَ وەریوەکان، ل ١٣٧ – ١٤١، چاپی یەکەم، چاپخانەی شەهاب، هەولێر) نوسیویەتی:** کەچوەتە هەڵەبجە بۆخزمەت مامـەڕەزا کاتێـك کەدوور خرابۆوە بۆ ئەوێ و داوای لێ کردووە وابکـات ژمارەیـەك لەکەسـانی سـەر بـە (حیزبـی شـیوعی عیراقـی) لەخـەڵکی شـارەکانی (سلێمانی و هەڵەبجـەو هـەولێر) کەلەلایـەن حکومـەتی ئـەو سـەردەمەی عیراقـەوە هـەوڵی دەسـتگیر کردنیـان درابـوو لەلادێیـەکانی سـەر بەهەقـە بحەوێنەوە،مامـەڕەزایش بـەڕوو خۆشـیەوە فەرمویـەتی: بیانبەنە گوندی (چنارتوو) لەناوچەی (ئاغجەلەر) بالەوێ بمێننەوە چەندی پێویست بێ، بەلاَم ئامۆژگاریان بکـەن ئاگایـان لـەداب و نـەریتی کوردایـەتی بـێ و بەرچـاوی بگـرن، ئـەم پەیوەندیـە دوای کۆچـی دوایـی مامـەڕەزاش بەردەوام بووە لەسەردەمی (کاکەحەمە)ی کوڕی (مامەڕەزا) دا کەبووبوو بەجێگرەوەی باوکی، کاتێك کـەکودەتا خوێناویەکـــەی بەعســـیەکان ڕوویـــدا لەشـــوباتی ١٩٦٣ دا ژمارەیـــەکی زۆر لەشـــیوعی و دیمـــوکرات و نیشـتیمانپەروەرەکان لەهـەموو ناوچـەکانی عیراقـەوە ڕوویـان کـردە کوردسـتان و چـوونە نـاو شۆڕشـی کـورد، هەقەکان لـە (کەلکـە سمـاق) بەگـەرمی پێشـوازیان لێکـردن و خزمـەتیان کـردن تـا هـەوری ڕەشـی کودەتایەکە ڕەویەوەو گەڕانەوە بۆشوێنی خۆیان، لەسـالَی ١٩٦٣ ش بنکەیـەکی حیزبـی شـیوعی لـە (کەلَکـەسماق) بـووە . **مامۆستا (کەریم ئەحمەد)یش لەکتێبی (المسیرە) کە بەڕێز (جـەلال دەبـاغ) بـەناوی (ڕێـڕەوی تێکۆشـان) وەری گێڕاوەتە سەر کوردی و سالَی ٢٠٠٧ لەسـلێمانی لەچـاپ دراوە** باسـی پەیوەنـدی مامـەڕەزای بەئاشـتی خـوازان و بەحیزبی شیوعیەوە کردووە .

**لەپەڕتوکی (بۆ لەهەقە کەوتنە تەقە؟)لاپەڕە (١٧٦)دا هاتووە:** لەدێی (گەڵنێری)دا جاڕی (تەسویە) دەدرێ ئاغایەکانی ئەم ناوچەیە دەیانویست زەوی زاری ئەم دێیە لەسەر خۆیان تەسویەو تاپۆ بکەن، فەلاحەکان و خاوەنی ئەصلی زەویەکانی لێ بێ بەری و مایە پوچ بکەن . **لەپەڕتوکی (ئاوڕدانەوەیك لەبزووتنەوەی هەقە – مستەفا عەسکەری)شدا وتراوە:** فەلاحەکانی ئەم دێیە تینیان بۆدێت و هانا بۆ خوالێخۆشبوو مامەڕەزا دێنن کەفریایان بکەوێت لەکۆششی ڕەشی ئەم ستەمکارانە ڕزگاریان بکات .. خوالێخۆشبوو مامەڕەزا دێت دێی (گەڵنێری) لەسەر خۆی تەسویە دەکات بەلاَم خوالێخۆشبوو مامەڕەزا دوای تەکاندنەوەی ئەو ئاغایانە لەخاوەنداریێتی زەوی و زاری دێی (گەڵنێری) ئینجا دێت و زەوی و زاری ئەم دێیەو کێلَگەکانی هەمووی بەناوی

خاوەنەکانیانەوە لەتەسویەدا بەشێوەیەکی ڕەسمی دەداتەوە بەخاوەنەکانی .

**لەپەڕتوکی (بۆ لەهەقە کەوتنە تەقە) لە لاپەڕە (١٦١، ١٦٢) (ڕەئوف محمد زوهدی) دا هاتووە:** لەکاتێکدا کە مامەڕەزا دوور خرابۆوە بۆ هەڵەبجە، گەلێك جار بۆدیدەنی و پێڵاو دروست کردن دەهاتـە دوکـانی (عبـدالله زوهـدی) بـرام، دوای هەواڵ پرسین زۆرجار لەبابەت هەقـەوە گفتوگۆمـان دەکـرد، لـەبارەی ڕێبازەکەیانـە پرسـیارم لـێ دەکـرد، مامەڕەزاش بەزەردەخەنەیەکەوە وەکو مجامەلەیکی بەنەزاکەت و بەسـۆز تـاکو چـوونە نـاو مەسـەلەکانەوە، لای منیش ئاسان بێت و پێشەکیەکی هەبێ و دەیفەرموو: (تۆ نەصۆفیت و نـەدەروێش بـەلام ئەوەنـدە بزانـە یـەکێك لەسیفەتە گرنگەکانی ئەهلی تەسووف قەناعەتە)، هەروەها دەیوت: (ئێمە چـۆن دەتـوانین لـەناو موریدەکانمانـدا پەرەی پێبدەین، هەر تەنها بەوەعزو نەسیحەت و ئیرشاد و ئامۆژگاری و بـەس، ئـیتر سـنورێك بـۆ چاوچـنۆکی و تەماع دانەنێین وەیان هیچ دەستێکی بۆ نەهێنین، کەلـەم حاڵەتـەدا دەبینـە یارمەتیـدەرێکی باشـی چاوچـنۆك و تەماعکاران چونکە لێیان بێدەنگ دەبـین، وەیـا لـە بـەتین تـرین زەبـرو زەنگدا لەبەرانبـەریان حەواڵـەی خوایـان دەکەین، کە بەمە هیچ باکیان نیە، چونکە لەتەماعکاریان خواردووەو لەزەتیان لێ دیوە، بەم پێیە ئێمەش دێـین بەناوی قەناعەتـەوە دەبینـە یارمەتیـدەری تـەماع و تـەماعکاری بـەدەمکوت کردنـی موریـدەکانمان چـونکە قـڕو قەپیان پێدەکەین کەناوی کەس نەهێنن . دیسان چۆن دەتوانین تەماعکاری بنەبڕ بکەین ئەگـەر دەسـت نەبـەین بۆ ڕەگ و ڕیشە ئابوریەکەی کە موڵکیەتی فەردیە واتە (خاوەندارێتی تـاکی) کـەوا خـۆراك هانـدەری یەکەمـە بـۆ تەماع و تەماعکاری و نەیگۆڕین و نەیکەین بەموڵکی گشتی، ئەگەر وانەکەین نەقەناعەت لەناوماندا گەشـەدەکات وە نەدەسەڵاتیشمان بەسەر تەماع و تەماعکاریدا دەشکێت . هەروەها دەیفەرمو: ئێمەی هەقـەکان هیچـی وامـان پێ نیە کە لەخەڵکی بشارینەوە مەگەر ناحەز شتی ناڕەوامـان بدەنـە پـاڵ ئـیتر وەکـو دەڵـێن (مـەنزڵ هـەر پـاك دەیبڕێت)، منیش وتم: ئایا دەزانن ئەم دەست درێژی سەر ملکیـەتی و خاوەندارێـی تووشـی گێـرەو کێشـەیەکی فەلسەفیتان دەکان کە لەوزەی ئێـوەدا نیـە ؟ . فـەرمووی: بـەڵێ دەزانم ئـەم هـەموو بوختـان و درۆو دەلەسـانە کەدوای ئێمەخراوە، ئەو هەموو تەق و تۆقەی کەوا لەئێمە دەکرێت لەئەنجامی ئەو نیاز و ڕێبازەمانەوەیـە ئەمانـە هەموو بەشێکن لەو گێرە فەلسەفیە . دیسان دەیفەرموو: بۆچی لەم دنیایەماندا خاوەنـدارێتی لـە (خواوەنـدێیتی جیا نەکرێتەوە) یەعنی خاوەندارێتی لەلایەن ئادەمیزادەوە، کە لەئەنجامی ئەم تێکەڵ کردنەدا هەرچی نـاڕەوایی و خراپیەکی خاوەندارێتی هەیە لەم دنیایەماندا ئاوقای (خواوەندێیتی) دەبێت و یەخـەی ئـەم دەگرێتـەوە، ئـەی ئەمە بۆ باوەڕو بڕوا زەرەدی نیە ؟ .هەروەها دەیفەرموو: ڕۆڵە دەرەبەگەکانیش دیوەخانەکانیان بەدامـەزروانێکی گشتی دەزانن کە هەموو کەسێك بۆی هەیە ڕووی تێبکات و پەنای بۆ بـەرێت، بـەلام ئایـا جێـێ هـەموو کەسـێکی تێدا دەبێتەوە ؟ وەیا هەموو کەسێك بۆی هەیە کـەوا ئـەرك و مەسـرەفی خانـەقاو تەکیـەو دیوەخـان بپرسـێت و بکۆڵێتەوە؟ خۆ ئەگەر یەکێك پرکێشی بکات و لەسەری بڕوات وەلامەکەی لە: ڕسقێکە خوا ناردوویـەتی بـەو لاوە زیاتر نیە . هەروەها دەیفەرموو: لەناو ئێمـەدا چ پیـاوو چ ئـافرەت بـۆی هەیـە لەهـەموو شـتێکی گـەورەو بچوك بپرسێـــەوە هـــەموو مریـــدەکانمان دەتـــوانن بەوپـــەڕی ئازادیـــەوە لەهـــەموو شـــتێك بـــدوێن و ڕەخنـــە بگـــرن

بالێدوانەکانیشـــیان پەیوەنـــدی بەشەخصـــی شێخیشـــەوە هەبێـــت و ئـــەم بگرێتـــەوە .

**ڕاو بـۆچـوونـی ( مامە ڕەزا ) لـەبـارەی بـەرپاکردنی شۆڕشی ئەیلول:**

دیارە لەساڵی ١٩٦١ نوێنەری (ئاغـا میراودەلیـەکانی پشـدەر)و (ئاغاکـانی ئـاکۆ)و و چـەند کەسـایەتی و شـێخ و سەرۆك هۆزێك چوونە بەغدا لای (مـەلا مسـتەفا بـارزانی) کـە لـە(ڕوسـیا) گـەڕابۆوەو لـە بەغـدا دانیشـتبوو لـەناو کەسایەتیەکاندا (شێخ حوسێنی سندۆڵان یان بۆسکێن) (عباسـاغای ئـاکۆ) (کوێخـا سمـایلی تـەلانی)و (سمـایلی سواراغای بلْباس) ئەم کۆمەڵە کەسایەتیە لەبەغدا داوا لە مەلا مسـتەفای بـارزانی دەکـەن کـەبڕیاری بـەرپاکردنی شـۆڕش بـدات و بگەڕێتـەوە کوردسـتان و ئـەوانیش بەهـەموو توانایـەك پشـتیوانی شۆرشـەکەی دەکـەن، دیـارە پاڵنـەری سـەرەکی ئـەوان بـۆ بـەرپاکردنی شـۆڕش چـینایەتی بـوو لـە ئـەنجامی ئـەوەبوو کـەوا حکومەتەکـەی (عبدالکریم قاسم) کـە مـەیلێکی شـیوعیانەی هـەبوو بڕیـاری ئیصـلاحی زراعـی دابەشـکردنی زەوی و زار بەسـەر جوتیارانیدا دابوو کە ملْکدارە گەورەو ئاغایـەکانیش نەیاندەویسـت لەکوردسـتان جێبـەجێ بکرێـت، وەکـو بـەڕێز **(شێخ هاوڕێ کاکە حەمە مامە ڕەزا) لەو بارەوە گوتی:** جا ئەوەبو نوێنەری ئاغایەکانی پشدەرو (شێخ عبدولخالق ی شێخ عبدالکریم) ی شەدەڵەو (کوێخا سمـایلی تـەلانی) و (عەباسـا غـای ئـاکۆ) دێنـە لای (مامـە ڕەزا) و داوای لێدەکەن کە ئەویش ئیمزای ئەو یاداشتنامەیان بۆبکات کەبەناوی سەرۆك هـۆزو شـێخ و ئاغایـەکان نوسـیبویان و دەیان برد بۆ بارزانی تا قەناعەت بکات بڕیاری گەڕانەوە بۆ کوردستان و بەرپاکردنی شۆڕش بدات . دیارە (مامە ڕەزا) لەگەڵ ئەو ڕایەی ئەواندا نابێت و پێیان دەڵێت: لەگەڵ ئەوەشدا کەئیمزاتان بۆ ناکەم بەڵام دژیشتان نابم و بارودۆخەکە ئێستا گونجاو نیـە بـۆ شـۆڕش و شۆڕشـیش هـەروا بـە هەڵچـونێك ناکرێـت و بـە پەسـەندی نـازانم و پێویستە ١– میللەتی کورد سەرەتا باش وشیار بکرێـتەوە . ٢– ڕێکخستن و ئامادەکاری تەواوی بۆبکرێـت . ٣– لەدەرەوە پشتیوانی بۆ کورد لەڕووی ماددی و مەعنەوی دەسـتەبەرو پەیـدا بکرێـت و دوای ئـەوەش باشـتر وایـە بەشێوەیەکی ئاشتیانە بەیاداشت داوای مافەکانی کورد لەحکومەتی عیراقی بکرێت بەتایبەتیش کەئێستا جێگری سەرۆك کۆماری عیراق و حەوت وەزیر کوردن جیـا لـە ئەفسـەرو قایمقـام و مـودیر ناحیـەو پۆسـتی تـر کـە کـورد هەیانە جا ئینجا کەئێمـەش شـۆڕش ڕابگەیـەنین دیـارە بەدەسـتی خۆمـان ئـەو پۆسـتانە لـەکورد دەسـتێنینەوە هەربۆیە پێویستە بەهۆشیاری و ئاشتیانە مامەڵە لەگەڵ حکومەتی عیراقیدا بکەین نەك بە پەنا بردنە بەر چـەك و ئێوە کەشوانێك دەهێنن و تاپڕێکی دەدەنە دەست کابرا نازانێ ئامانجی چیە ؟ بۆچی شۆڕش دەکات ؟ هەربۆیە من وای بەپەسەند دەزانم وەکو ئێمەی هەقە کە (داری سەلامەتیمان هەڵگرتووە) واتـا (دارە قوڵـە) ئـەوە بکرێـت باشترە . ئەگەر ئاغاو موڵکدارەکانیش ڕاست دەکەن کە شۆڕش بۆ میللەتی کورد دەکەن باپێشەکی خۆیان مافی جوتیارو هەژارانی بندەستی خۆیان بدەن بەدابەشکردن و پێدانی زەوی پێیان و باج و بێگاریان لەسەر هەڵگرن و خۆمان ئیصلاحی زراعی بکەین باشترە لەوەی حکومەت بەسەرماندا بکـات کـە ئەمـەش دەبێتـە مایـەی متمانـەو هاوسۆزی و پشتیوانی میللەتەکەمان بۆمان .

**شمشاره/** دیاره کەبارزانی لەلایەن ئەو توێژانەی کەئاماژەیان پێکرا ئیحراج کراو ناچاریان کرد بگەڕێتەوە کوردستان و شۆڕشەکە بەرپاکرا جیا لەچەند کەسێك لەو کۆمەڵە کەسانە دواتر دژی شۆڕشەکە وەستانەکە خۆیان دایەپاڵ حکومەتی عیراقی.

**پرسیار/** دەوترێ ناولێنانی بەڕێزتان بەهاوڕێ دەگەڕێتەوە بۆ هاوسۆزی مامە ڕەزاییەکان بۆ حیزبی شیوعی عیراقی ؟ کە لەساڵی ١٩٥٨ بەهۆی هاتنە سەرکاری (عبدالکریم قاسم) کە شیوعیەکان پشتیوانیان لێی دەکرد ئەوەبوو تەوژمی شیوعیەت عیراق و کوردستانی گرتەوەو بەتایبەتیش کەئێوە لەدایکبووی ساڵی ١٩٥٩ ن ؟

**شێخ هاوڕێ/** لەڕاستیدا ناولێنانی من (بەهاوڕێ) لەلایەن باوکم (کاکە حەمەی مامە ڕەزا)وە نەبووە بەڵکو پێش باوکم باپیرەم (مامە ڕەزا)پێشنیاری کردووە کەناوم لێ بنرێ (هاوڕێ)، وتوشیەتی دەبوایە ناوی لێبنێین (غەمگین) بەلاَم با ناوی (هاوڕێ) بێت، کە ئەمەش پێش هاتنی هەندێ لە سەرکردەکانی حیزبی شیوعی بووە بۆ (کەلکە سماق) .

**شمشاره/ دیاره (مامە ڕەزا) هەشت خاڵی دانان بۆ ڕێکخستنەوەی کۆمەڵی (هەقە) کەوا (مستەفا عەسکەری) لەپەرتوکی (ئاوڕدانەوەیك لەبزووتنەوی هەقە، ٢٠٠٨) خاڵەکانی بەجۆرە ڕیزبەند کردوون:** (برایەتی، هەقپەرستی، گیانی هاوبەشی، ئابونە، تەکبیرو ڕا، سەربەستی ئافرەت، ڕەوشت، کاروباری ڕێکخستن)، کاك (شێخ هاوڕێ) سەبارەت بەم ڕیزبەندیە ڕای وایە کەبنەمای ڕەوشت بنەمای یەکەمە لەپێش بنەمای برایەتی لەبەرئەوەی ڕەوشت واتاو ڕەهەندی زۆرتر لەچاو برایەتی لەخۆی دەگرێت .

## داره قوڵە مامە ڕەزاییەکان چی بووە ؟

لەپەرتوکی (ئاوڕدانەوەیك لەبزووتنەوەی هەقە – مستەفا عەسکەری) لە لاپەڕە (٥٤) محمدی مەلا کەریم لە پەراوێزی (٦٥)دا نوسیویەتی: ساڵی ١٩٤٤ حکومەتی عیراقی (مامە ڕەزا) دوور دەخاتەوە بۆ (عەمارە) و مامە ڕەزاش داوا لە هەقەکان دەکات کە دوابەدوای ئەو بڕۆن و نەگەڕێنەوە دواوە تا حکومەت ناچار دەبێت بیگەڕێنێتەوە (کەلکە سماق) . ئیتر هەقەکان لەسەر داوای (مامە ڕەزا) ماڵ و سامان و خانوی خۆیان دەفرۆشن و لەناوچەکانی خۆیانەوە بەرەو ناوچەی (ئاغجەلەر) دەکەونە ڕێ، ماوەیەکی کەم لەگوندی (گۆپتەپە) دەمێننەوە تاهەموویان یەك دەگرنەوە ئینجا ڕووەو ناوچەی (شوان) بەڕێ دەکەون بۆئەوەی لەوێ بڕۆن بۆ (کەرکوك) لەنزیك گوندی (حاجی بەیخان) حکومەت ڕێیان پێدەگرێ و چەند کەسێکیان لێ دەستگیر دەکات و ڕەوانەی کەرکوکیان دەکات بەلاَم خەڵکەکە هەر لەسەر ڕێ ڕۆشتنەکەی خۆیان بەردەوام دەبن تادەگەنە گوندی (یار وەلی)و لێرەدا حکومەت لەگەڵیاندا دەکەوێتە گفتو گۆوە، ڕێ ڕۆشتنی هەقەکان بەم چوون و گەڕانەوە سێ مانگێك دەخایەنێت و ڕێ ڕۆشتنەکە لەمانگی ٩ی ١٩٤٤ دەستپێدەکات و لەمانگی ١٢ی هەمان ساڵیشدا کۆتایی پێدێت و ژمارەی هەقەکانیش لەدوا مەنزڵگەدا واتە لە (یار وەلی) دا گەیشتۆتە دوانزە هەرزار کەس، (محمد مەلا کەریم)یش لەپەراوێزەکەی سەبارەت بەو خۆپیشاندانەی مامە ڕەزاییەکان دەنوسێت: ئەم خۆپیشاندانەی هەقەکان بەشێوەیەکی ئاشتی خوازانە بووە تەنها چەکی دەستیان (دار) بووە کە هەریەکەیان دارێکی سوری

بەدەستەوە بووە لەداری (بەلاڵوك) یـان لـەداری (چـواڵە) هـەر بـەو هۆیەشـەوە بـووە کـە ناحـەزەکانیان ناویـان لێنابوون (دارە قوڵە) .

**(ئاورەحمان رسول قادر گەڵنێری) ساڵی ١٩٣٠ بەشداربوویەکی ڕێ ڕۆیشتنەکەی (دارە قوڵـە) بـۆی بـاس کـردین وگوتی:** خەڵکەکە لە (کەرکوك) چووینە لای خانوەکەی (لاین) لاینیش چووە سەر خانوەکەی و قسەی بۆ کـردین و گوتی: بڕۆنەوە  بە حەوت ڕۆژی دیکە ئێمە مامە ڕەزاتان بۆ دەنێرینەوە. خەڵکەکەش گوتیـان: دەبـێ چـاومان پێی بکەوێت دەنا ناڕۆینەوە، ئەوەبوو مامەڕەزا لە ئۆتۆمبیلێکدا بەلاماندا هات و سەلامی لێ کردین و تێپەڕی کـە بۆ (هەڵەبجە)یان برد و شەش مانگیش لەوێ مایەوە، هەروەها بەڕێز (کاك شێخ هـاوڕێ کاکـە حەمـە مامـە ڕەزا) ش لەو بارەو زیاتر گوتی: دورخرانەوەکەی مامە ڕەزا لە کەڵکە سماق پێنج ساڵ بووە کە شەش مانگ لـەبیارە و دواتر هەڵەبجە و ئینجا سلێمانی و تا ساڵی ١٩٤٩ گەڕاوەتەوە کەڵکە سماق.

لە بەدواداچوونی ئێمەش لـە ژمـارە (٥٠- شمشـارە) لـەبارەی (دارەقوڵـە) وە ئێسـتاکەش نمونەیـەکی دارەقوڵـە لەخانەقاکەی کەلکە سماق وەکو هێمایـەکی مامـە ڕەزاییـەکان بـۆ نمونـە بـەدیواردا هەڵواسـراوە . بـەڕێز (شـێخ هاوڕێش) پێمانی وت پیرێژنێك لە ناحیەی (تەقتەق) هەیە کەکاتی خـۆی بەشـداری ڕێ ڕۆشـتنەکەی دارە قوڵـەی کردووە تاکو ئێستاکەش دارە قوڵەکەی ئەو سەردەمەی پاراستووە وەکو شـتێکی پـیرۆز  هەرچـەندی داواشمـان لێ کردووە نەیداوە بەئێمـە . هـەر لـەوبارەوە لـە (ژاراوەی پشـدەر) یـەکێکی تـر لەوکەسـانەی کەبەشـداری ڕێ ڕۆشتنەکەی دارە قوڵەیان کردووە هەر بەو هۆیەشەوە بە (سمایل دارە قوڵە) ناسراوە لـەدایکبووی ١٩١٢ گونـدی (بێ موشە)ی مەرگەیـە وتـی: لەگـەڵ (خـەجیج خـدر)ی هاوسـەرم بەشـداری ڕێ ڕۆشـتنەکەی دارەقوڵەکـەم کـرد ئەوەبو لەناو کەرکوك زرێ پۆشێك بەرانبەر ئاپۆرای خەڵکەکـە وەسـتا کـەنێوان زرێ پۆشـەکەو خەڵکەکـە جۆگـە ئاوێك بوو، یەکێك لە بەشداربووەکان کەناوی (مامە قالە) بوو هاواری کرد (یاکـەریم یـا ڕەزا) و بـەرەو ڕووی زرێ پۆشـەکە بـوەوە خەڵکەکـەش بەدوایـدا دەسـتی پێکـرد کـەمنیش یـەکێك بـووم لـەوان و وروژمـمـان بـرد بـۆ زرێ پۆشەکە، کە ئەوەبوو زرێ پۆشەکە یەکسەر پاشەکشەی کردوو شوێنەکەی بەجێ هێشت، ئینجا خەڵکەکـە ڕووی کردە ماڵی (لاین) بەرپرسی ئینگلیزەکان ئەوانیش بیسـت کەسـێك بـەدارەوە وەك ئێمـە هاتنـە پـێش خەڵکەکـەو وتیان: لێرە دوور بکەونەوە. دواجار خەڵکەکە ڕووی کردە گەڕەکی (مـام قاسـم) کـە (ئایشـە) یـەکێ لەکچـەکانی مامە ڕەزا لەماڵێکی (مام قاسم) گیانی لەدەستدا، یەکێ لەموریدەکان لەکاتی گەڕانەوەی خەڵکەکـە ئێسـترەکەی خۆی فرۆشت و مەڕی پێ کـڕین بـۆ خـۆراکی خەڵکەکـە، لەگەڕانەوەشـدا لـەنێو خەڵکەکـە دەنگـۆ بـلاو بـۆوە کـە هەقەکان سەر بە (یەکێتی سۆڤیەتن) ئیتر من لەو کاتەوە لێیان دوور کەوتمەوە.

بەڕێز (حاجی صالح حەمە شەریف شەمێ) لەدایکبووی ١٩٢٨ کەئێسـتاکە لەناحیـەی (چـوارقوڕنە) نیشـتەجێیەو خۆیشی لەڕێ ڕۆیشتنەکەی دارەقوڵە بەشداربووە وتی: ئەوکاتـەی کەمنداڵ بووم لەگەڵ بـاوکم و مامـەکانم چـووم بۆ شەدەڵەو دەستی شێخ عەبدالکەریمم ماچ کرد بەڵام لەبەرئەوەی منداڵ بووم تەریقەتی پێ نەدام و دواتر بـووم بەهەقە لەسەردەمی مامەڕەزادا خۆم و دایکم و خوشکم بەشداربووین لەڕێ ڕۆیشتنەکە و کەگەیشتینە (پلەی مام

قـاسمی کـەرکوك)  بیسـت بـۆ سـی فرۆکـەی گـەورە بەسـەر ئـاپۆرای خەڵکەکـەدا ڕەت بـوون و سـەرکردەی ڕێ ڕۆیشتنی دارەقوڵەش (شـێخ بـەکری شـێخ ئاورەحمـانی سـەرگەڵوو) بـوو کـە بـەناو گـەڕەك و بـازاڕی کەرکوکـدا دەڕۆیشتین دارەقوڵەکەمان بەرز دەکردەوە کـە بەبازاڕەکەشـدا ڕەت بـووین زۆربـەی دوکانـدارەکان ترسـیان لـێ نیشت و دوکانەکانیان بـەکراوەیی بـەجێ هێشـت بـەڵام (شـێخ بـەکری شـێخ ئاورەحمـانی سـەرگەڵوو) ئاگـاداری هەمووانی کردەوە کە بەهیچ شێوەیەك نابێ دەست بۆهیچ شتێك ببرێ و خۆی بـانگی دوکانـدارەکانی دەکـردەوە کەبێنەوە، هەروەها کە (شێخ بەکری شێخ ئاورەحمانی سەرگەڵو) ئاگاداری خەڵکەکەی دەکردەوە بۆ هـەنگاونان و ڕۆیشتن دەیـوت: (یاکـەریم یـاڕەزا) کـە ئـەوکات هەنـدێك کـەس لەخەڵکەکـە دەیـانگوت: وامـەڵێن دەنـا لـەدین وەردەگەڕێن، (مەلا محمدی کوێرەکانی) و (مەلا ڕازی) و (مەلا محمد أمینی هەنجیرەی مەرگە)ش بەخەڵکەکـەیان گوت: وانیەو یا کەریم یاڕەزا ناوی خوان .

## دارە قـوڵـە هـێمـای بـەرگـری ئـاشتـیانە

بەڕێز (شێخ هاوڕێ کاکە حەمە مامە ڕەزا) دەربارەی دارە قوڵە وتـی: مامـە ڕەزا کـاتی خـۆی دارەقوڵـەی وەکـو هێمایەك بـۆ بـەرگری ئاشـتیانە زانیـوەو بـەزۆریش لـەئاخاوتن و قسـە کردنـدا وتویـەتی ئێمـە (أنصـار السـلام = پشتیوانانی ئاشتین) داری سەلامەتی هەڵدەگرین، کە مەبەستیشی لەوە ئەمـە بـووە پـەیڕەوو موریـدەکانی پـەنا نەبەنە بەر چەك و تەنها لەکاتێکدا کـە پـەلامار بـدرێن و دەسـت درێـژیان بکرێتـە سـەر بـەو دارە قوڵـە بـەرگری لەخۆیان بکەن .

## مەبەست لە دروشـمـی ( یـاکـەریـم یـاڕەزا )ی مـامـەڕەزاییـەکـــان

دەستەواژەو دروشمی (یاکەریم یـارەزا) لەسـەردەمی مامـە ڕەزادا لـەناو هەقەکانـدا سـەری هەڵـداوە لەپـەرتوکی (ئاوڕدانەوەیەك لە بزووتنەوەی هەقە/ مستەفا عەسکەری)دا هاتووە لەکاتی چـاو بەیـەك کـەوتن و چـاکو خۆشـی لەگەڵ یەکتر کردندا هەقەکانی باڵی مامە ڕەزا دەستیان دەخستە ناو دەستی یەکترو دەیان وت (یاکەریم یـاڕەزا) و مەبەستیان ناوی خوا بوو، ئەمە جۆرە تەوقەیەك بوو پیاوو ژن و گـەورەو چـوك دەیـان کـرد ئـیتر دەسـت مـاچ کردنیان لەناودا نەبوو ن بەڕیز لەلای ڕاستەوە بۆلای چەپ دەستیان دەکـرد بـە تەوقـە کـردن بـێ ئـەوەی کـەس ببـوێردرێ و هـەموو هەڵدەسـتانە سـەر پـێ بەتایبـەتی لـەناو هـەموو  ڕەوشـتەکاندا بـەمجۆر تەوقەیـەش دەوتـرا (ڕەوشت) .

لەپەراوێزی ژمارە (١٣)ی ئەم بابەتەشدا بەڕێز (محمدی مەلا کەریم) دەڵێ: من وای بۆ دەچم لەڕاستیدا مەبەسـت لە (کەریم و ڕەزا) (شێخ عبدالکریم و مامە ڕەزا) بووبن بەتایبـەتی کـەوا دیـارە ئـەم دروشمـە لەسـەردەمی مامـە ڕەزا داهاتووە نەك سەردەمی شێخ عبدالکریم دا کەهێشتا نەدەزانرا پاش ئـەو کـێ ئـاڵای شـێخیەتی هەڵـدەگرێ، هەرچۆنێك بێ ئەوکەسەی ئەم دروشمەی خستۆتە سەر زاری خەڵك ئەوەندە زیرەك بووە بتوانێ بڵێ مەبەستم لە (کەریم) ناوی خوا و لە (ڕەزا)ش ئیمام (علی ڕەزا)ی کوڕی (ئیمـام موسـای کازمـە)، ئێمـەش لـە گۆڤـاری ژمـارە

(٥٠)ی (شمشارە)دا لەکاتی سەردانمان بۆلای (کاك شێخ هاوڕێ) لە (کەڵکە سماق) ئەو میوانانەی کەدەهاتنە لای لەموریدو لایەنگرەکانیان لەجیانی سەلام کردن ئەم دروشمەیان لەگەڵ تەوقە کردن لەگەڵ یەکتر دەوتەوە .

## مامە ڕەزاییەکان لەدادگای دەوڵەتی ژنیان مارە نەکردووە

بەڕێز (مامۆستا مەلا أحمد شەریف فەتاح) ناسراو بە (سیوەیلی) کەساڵی ١٩٣٤ لەگوندی (گۆگڵێ – ی سیوەیلی شارباژێر) لەدایك بووە و ئێستاکە لەگەڕەکی (کارێزە وشکی سلێمانی) نیشتەجێیە و خانەنشینە، ساڵی ١٩٤٧ دەچێتە بەر خوێندنی مەلایەتی لەگوندی (ڕەشە کانی) وەکو خۆی باسی کرد ساڵی ١٩٥٤ بە فەقێیەتی چوومە کەڵکە سماق و چوار ساڵ لەوێ مامەوەلەماوەی ئەو چوار ساڵەدا کە لەکەڵکە سماق بووم قسەو ڕەفتارێکی ناشیرینم لە هەقەکان نەدی، هەموو مانگێکی ڕەمەزان دوو شەو بەپارشێوەکەشیەوە فەقێیەکانی گوندەکە لەلایەن (فاتمە خانی خانەقا)وە دەعوەتی نانخواردن دەکراین جیا لەوەش ماڵی مامە ڕەزا هەر خێرو یارمەتیەك کە دەیان بەخشی بەخەڵکی گوندەکە حوجرەو فەقێیەکانیشیان بەشداری دەکرد، ڕۆژێکیان مودیر ناحیەی (میرزا رۆستەم) هاتە لای مامە ڕەزا لەکاتی ڕۆیشتنندا مودیر ناحیەکە نوسراوێك دەداتە دەست مامۆستایەکەمان کەناوی (مەلا حامیدە ڕەش) بوو کەئاگاری کردبۆوە نابێ ئافرەت بەبێ ئیعلانی حکومەت مارە بکەیت و بکرێ، مامە ڕەزاش لەوبارەوە ناردی بۆلای مامۆستاکەمان واتە مەلای گوندەکەو وتبووی: ئێمەی هەقە بەئیعلان ژن مارە ناکەین. بۆئەوەی مامۆستاش تاوانبار نەبێ لەلایەن حکومەت با یەکێك لە فەقێیەکان دیاری بکات بۆ مارە کردنی ژنخوازی ئێمە، ئەوەبوو (مەلا حامیدە ڕەش) منی دیاری کرد بۆ ئەم کارە کەدووجار لەلای مامەڕەزا دا مارەکردنی هەقەکانم بەگوێرەی شەریعەتی ئیسلام ئەنجامدا و هیچ ڕەخنەو لارییەکیان نەبوو هەتا ئەوەی یەکێ لەجارەکان پێنج دیناریشیان مارە بڕی مەلا پێدام کە لەوکاتەدا بڕێکی زۆربوو ئەوەبوو منیش ڕەتم کردەوە بۆیان و وتم: با بۆ خانەقایەکەتان بێت، یەکێکیان لەهەقەکان دوو دیناری تریشی خستە سەرو وتی: ئەوا لەخانەقاوە دەیگێڕمەوە بۆتۆ ئەمەش بەڵگەیە کە هەقەکان دادپەروەریان هەبوو.

## کاکە حەمەی مامە ڕەزا میوانداری حەمەسووری ڕەتکردۆتەوە.

(حسێن حاجی محمد – سمایل بەگی) لەدایکبووی ١٩٣٢ناوبراو کەخۆی (مامە ڕەزا)ییەو ئەوڕۆژە کەئێمە لە کەلکە سماق بووین ئەویش بەسەردان هاتبووە خانەقا بۆی باسکردین کەجارێکیان (کاکە حەمەی مامەڕەزا) بۆ بەسەرکردنەوەی مامەڕەزاییەکان لەناوچەی (شوان) دەچێتە (کلاۆقوت) و لەماڵی (عبدالله ی پیرۆز) میوان دەبێ، کە سێ ڕۆژ لەوێ دەمێنێتەوە، خۆم ئاگاداربووم هەموو ڕۆژێك (حەمەسور) بەدەستی خۆی میوەی لەباخەکەی خۆیان بۆ (کاکەحەمە) دەهێناو زۆریش داوای لێدەکرد کەمیوانی بێت بەڵام (کاکەحەمە) وتی: من ناتوانم، مامەڕەزاش پێشتر حەمەسوری وەکو نوێنەری خۆی حیساب بۆ کردووە، بەڵام دواتر کەجیابۆوە دەیگوت: ئەوەی کە سەر بەئێمە بێ نابێ بەقسەی ئەو بکات و جیا لە (حەمەسور و حسن جوبلاغی) هەر یەکێکی تریان گەر بگەڕێتەوە لامان وەری دەگرینەوە .

## وەسیـەتیـّکـی مـامـە ڕەزا

**وەکو بەڕێز (شێخ هاوڕێ کاکە حەمە مامەڕەزا) بۆی باسکردین وگوتی:**

(مامە ڕەزا) وەسیەتی کردووە هەرکەسێك ڕووی لەو خانەقایە کرد لێی مەپرسن چ کارەیە؟و خەڵکی کوێیە؟و خزمەتی چاکی بکەن ژن بێت یان پیاو

## دوای کۆچی دوایی کردنی مامەڕزا

بەڕێز (شێخ هاوڕێ کاکەحەمە مامەڕەزا) لەو بارەوە گوتی: کاکەحەمەی مامەڕەزای باوکم لەدایك بووی ١٩٢٩کەشەوی ٢٣-١٩٩٧/١٠/٢٤کۆچی دوایی کردووە شوێنی باوکی دەگرێتەوە. هەروەهابەڕێز (شێخ هاوڕێ کاکە حەمە مامەڕەزا) باسی ئەوەی کرد: سەرەتا بەهۆی کۆچی دوایی مامەڕەزاو چەند هۆیەکی تر تاساڵی ١٩٦٤ بەشداری چەکدارانەی نەکرد کەهۆکارەکەشی زیاتر دەگەڕێتەوە بۆ شۆڕش خۆی و چەند کەسانێك لەناو شۆڕشەکەدا، لەسەرەتای ١٩٦٤دا بەفەرمانی بارزانی مامەڕەزاییەکان پەلێك پێشمەرگەیان پێکهێنا کە سەر بەلقی (حاجی قەلاّ) بوو کە لەساڵی ١٩٦٥دا ئەو پەلە کرا بەلق و (کاك عبدالرحمن کوڕی مامەڕەزا) بوو بەسەر لقی و (تۆفیق مارف بۆلقامیش) بوو بەجێگری لقەکە، لقەکە لەچوار پەل و چوار جێگرو هەشت سەردەستەو جێگر پێکهاتبوو ئەم لقەی هەقەکان بەشداری شەڕەکانی زۆربەی ناوچەکانیان کردووە وەکو شەڕەکانی (چیای هەندرێن و قەرەداغ و گڵەزەردە و بەکرەجۆ و دەشتی هەولێرو کۆیە و دوکان و بەری مەرگەو گەورە قەلاّو پشدەرو قەندیل و بێرمکە) لەو پێناوەشدا شەهیدو برینداریشیان داوە، ساڵێ ١٩٧٥ یش کەشۆڕشەکە نشوستی هێنا پێشمەرگەکانی ئەم لقە بوون بەدوو بەشەوە بەشێك بۆ ئێران ڕۆیشتن و بەشێکیش بۆ عێراق گەڕانەوە.

## دەوترێ تەنیا گوندی ( کەڵکە سماق ) لەسەردەمی عبدالکەریم قاسم لەبۆردومانی فڕۆکە پارێزراو بووە

دەوترێ گوندی (کەڵکە سماق) لەساڵی ١٩٦١ و ١٩٦٢ لەبەرئەوە لەلایەن ڕژێمەکەی (عبدالکریم قاسم) جیا لەگوندەکانی دەوروبەری بۆردومانی فڕۆکە نەکراوە، چونکە (مامەڕەزا)و (کاکەحەمە)ی کوڕی پێشتر پەیوەندی یان لەگەڵ (عبدالکریم قاسم) و (حیزبی شیوعی عیراقی) دا هەبووەو خۆش بووە .

لەوبارەوە بەڕێز(شێخ هاوڕێ کاکەحەمە مامەڕەزا) ڕەتی ئەوەی کردەوە و وەکو بەڵگەش گوتی: ساڵی ١٩٦٢کەمن تەمەنم سێسالاّن بووە لەلایەن فڕۆکەی ڕژێمی (عەبدولکەریم قاسم) بەدوو بۆمبی ناپاڵم گوندی کەڵکە سماق بۆردومانکراوە.

پرسیار:ئایادەکرێت بزانین شوێنی بەرکەوتنی ناپاڵمەکان لەگوندەکە کوێبووە؟.

شێخ هاوڕێ:بەڵێ هەردوو ناپاڵمەکە بەر (بەری توان)ی گوندەکە کەوتبوونەوە و بێ زیان بوون و شوێنەوارەکانیشیان تاساڵی حەفتاکان هەرمابوو.

## ناوی خوشك و برا هەڤەكانی خانەقاكەی كەڵكەسماق

سوپاس بۆ بەڕێزان (كاك د. محمد) و (كاك شێخ كەریم شێخ تاهیر) كە ئەم ناوانەی خوارەوەیان لەخوشك و برا هەڤەكانی كەسەر بە خانەقای (كەڵكە سماق) بوون پێدابن:-

(شێخ محمدأمینی مەڵحە / ڕاوێژكاری مامەڕەزا)، (كاكەمینە سەرگەڵویی)، (مام عبداللە ڕەش سەرگەڵویی)، (باجی فاتم فەرەج سەرگەڵویی)، (كاكە بەكر شێخ ئاوڕەحمان سەرگەڵویی)، (مەلا سابیری صۆفی / سلێمانی)، (مەلا صالح عەسكەری/ قازی كۆیە)، (مەلا جەردیز / ڕێدار)، (مەلا حامید / جەڵەمۆرد)، (مەلا سەلامی ترێ خۆر / كەركوك)، (مەلا نامیق / ناڕوجەی كەركوك)، (حەمەدەمین عارەب / كەركوك)، (مام خورشید / ناڕوجەی شوان)، (حەمە قوربانی / قزلوی دەشتی كۆیە)، (كاكەحەمەی داكە فات / بۆگد—دەشتی كۆیە)، (مام یونس / كلێسە)، (كاكەڕەزای كاكەعەلی / عەسكەر)، (صۆفی مەولودی / ئۆمەر گومەت)، (حاجی شێخ عمر / گەورەدێ)، (كاكە مینە شێت / قەرانگوێ)، (عبداللە سور / سەرمۆرد)، (سەید عەلی كانی هەنجیر / سورداش) (خاتو حەنیف كانی هەنجیر—سورداش)، (سلێمان پێدارە / سورداش)، (عەلی مەغدید / تۆربەی بناری كۆسرەت)، (حەمە وەسمان / تۆربە بناری كۆسرەت)، (عەولآ جۆلآ / تۆربە بناری كۆسرەت)، (سەعید حەسەنە ڕەش / كەڵكەسماق)، (عبدارحمن مامە زەرد / كەڵكەسماق)، (سەعید حەمەشوان / سێ كانیان)، (عبداللە حەماغا / قەمچوغە)، (صۆفی مستەفا چاوشین / هەنجیرەی مەرگە)، (شەریف بابیل / كلێسە)، (مام كەریم ڕەشید / كلێسە)، (ئەحمەد مام مەجید / گۆپتەپە)، (كاكەحەمەی مام ڕەشید/ مۆرخوادا)، (شێخ محیەدین / شێخ حاجی)، (كاكەمینی سەرتەكیە / سەرمۆرد)، (مامەڕەشە / دۆڵمازەڵە)، (كوێخا صدیق / كوێرەكانی)، (مام عەبدولآ / شێخ پاڵەوانی ئاغجەلەر)، (كوێخا حەمەی شیلە / سنوری كۆیە)، (حەمەی فەقێ رسول / بەكرەجۆ)، (صۆفی محموداغای بێكڵۆ / پشدەر). بەڕێز (كاك محمد) ئەم ناوانەی خوارەوەشی پێداین كەدەڵێ: خۆم بەچاوی بینیومن كە لەخانەقای (كەلكەسماق)دا دەژیان:

(خاڵە مستەفا/ ئیللەلآ)، (كاكە عارف/ ئیللەلآ)، (مریەمی خاڵە)، (خاتو حەنیف)، (مەلا نامیق / ناڕوجە)، (خوشكە نەخشین/ ناڕوجە)، (یای زبێد / كۆیە)، (أحمد قادرە سور / كەڵكە سماق)، (ئەحمەد كوێرەكانی)، (مام قادری دێرێ/ پشدەر) (حسێن مام قادر دێرێ/ پشدەر)، (نەنكە ئامین كافرۆشی)، (مامەڕزا)، (خوشكە زێنەب)، (مام عبداللە ڕەش/ سەرگەڵو)، (باجی فاتم فەرەج/ سەرگەڵو)، (كاك حەمەڕوت/ سێ كانیان)، (خوشكە عەنبەر/ سێكانیان)، (حسن زارا / كەڵكە سماق)، (كاكە بەكری سەرگەڵو)، مینەی مانە شەلێ/ سێدەر)، (كاكە عەبەڕەش/ عەسكەری)، (باجی ئایشە خان / سەرگەڵو)، قالە گەورە / گردە سۆران)، (پورە ئایشەی تۆبزاوا)، (ڕەشید بەگ – هەڵەدن)، (دادەمینە / دوولكان)، (لالەمینی دوكاندار/ سەرگەڵو)، (باجی غەزال/ سەرگەڵو)، (مام عەباس/ شیوەجانی كۆیە)، (كاكە حەمە حەلە– كەڵكەسماق)،(علی مام فەرەج / سەرگەڵو)، (باجی خەجێ مام فەرەج/ سەرگەڵو)، (مام ڕەشید/ دزەیی)، (صالح قەفاری/ كەركوك)، (علی صالح /قەلآ چوغەی ئاغجەلەر)، (علی سێكانیانی)، (عبداللە سێدەری)، (خاڵە مستەفا/ كانی توو)، (حەمە حوسێن / نەی بەسەرە)، (مام خواكەرەم–عەسكەر)، (صاڵح مزگەر–سەرگەڵوو)، (عبداللە ی كوێخا حەمە شیلەی / كۆیە).

# بەشداری مامەڕەزاییەکان لەشۆڕشەکانی کورد لەسەرەتای چلەکانەوە

نوسینی: شێخ هاوڕێ کاکەحەمە مامەڕەزا

## پێشەکی:

لەو ڕۆژەی مرۆڤ دروست بووەو لەگەڵ قۆناغەکاندا بەرەو پێش چووە خەبات و تێکۆشان هاتۆتە پێشەوە کە لەسەرەتادا تێکۆشان بووە لەپێناوی پەیداکردنی بژێوی ڕۆژانەدا بەڵام لەئەنجامی پێشکەوتنی مرۆڤایەتی و تێپەڕبوونی قۆناغەکان سنوری دەسەلاتی مرۆڤ فراوان تر بووە و ژمارەشی بەرەو زیادبوون ڕۆیشتووە و هاتنە پێشەوەی دەسەلات سەری هەڵداوە تاگەیشتۆتە دروستبوونی خێڵ و عەشیرەت و دەوڵەت و سنور دانان، دیارە گەلی کوردیش وەکو هەموو گەلانی دنیا بەشدار بووە لەپێشکەوتنی شارستانیەتی مرۆڤ کەیەکێکە لە گەلە کۆنەکانی سەر ئەم زەمینەو خاوەن خاك و نیشتیمان و زمانی خۆیەتی دیارە دوای دروستبوونی دەوڵەتەکان و سنورە دەستکردەکانی نێوان دەوڵەتان نەخشە دانان بۆ دونیا کوردیش هەر لەسەرەتاوە ویستویەتی کەسنورو دەوڵەت و دەسەلاتی هەبێت لەو پێناوەشدا زۆر ڕاپەڕین و شۆڕشی کردووەو زۆرجاریش دەوڵەت و میرنشینی هەبووە تادەگاتە جەنگی یەکەم و دووەمی جیهانی یەکێك لەو قەوارانەش کە لەسەردەمی نوێدا کورد بەدەستی هێنا کۆماری مهاباد بوو لەساڵی ١٩٤٦ لەکوردستانی ڕۆژهەلات کەمامەڕەزاییەکان بەشداریان تێدا کردووە کەوا مامەڕەزا لەلایەن شێخ ئەحمەدی بارزانەوە ئاگادار دەکرێتەوە بۆ پەیوەندی کردن بەکۆمارەکە کەئەویش بەڕاوێژ لەگەڵ هەقەکاندا بڕیاردەدات کۆمەڵێك لەبرایان بنێرێت کە ئەم کارەی مامەڕەزا زۆر بەنهێنی بووە لەبەرئەوەی ئەوکات لەژێر چاوەدێری توندی حکومەتی عیراقیدا بووە، کە هەقەکان لەگەڵ بارزانیدا لەبەرەی سەقز دەمێننەوە تا ڕوخانی کۆمارەکە .

## لەشۆڕشی نوێدا:

لەشۆڕشی نوێشدا هەر لەسەرەتای بانگەوازی (یەکێتی نیشتیمانی کوردستان) چوونە دەرەوەی شەهید (عەلی عەسکەری) بۆ شاخ مامەڕەزاییەکان بەپۆلێك پێشمەرگە بەشداربوون کە ئەم پۆلە پێشمەرگەیە زۆربەیان شەهید بوون کە هەمووشیان بەچەك و پارەی خۆیان و یارمەتی کاکەحەمەو برایانی مامەڕەزا بوون بەپێشمەرگە، بۆ دووەم جاریش (شێخ عومەری کاکەحەمەی مامە ڕەزا) لەگەڵ کۆمەڵێك لە مامە ڕەزاییەکان بووە پێشمەرگەی شاخ و تا ساڵی ١٩٨٦ کە گوندی کەلکە سماق بەهۆی تۆپبارانی بەردەوامی ڕژێمەکەی (سەدام حسێن) چۆڵکرا ماڵی کاکەحەمەی مامەڕەزاش بەرەو دەشتی کۆیە ڕۆیشتن و چوونە گوندی (الا الله) دواتر (خاڵ خالان) و گوندی (چوخلیجە) لەوێشەوە بۆ (قزلو- ی دەشتی کۆیە) هەر لەم ساڵەدا کاکە حەمەو مامەڕەزاییەکان بڕیاریاندا بەپێچەوانەی زۆربەی ئەو خەڵکانەی دەچوونە ژێر باڵی ڕژێم و فەوج و مەفەرەزەیان دەکردەوە ئەوان سەنگەری کوردایەتیان هەڵبژاردوو بڕیاریاندا تیپێك بکەنەوە بۆ ئەو مەبەستەش چەند کەسێکیان کەتەمەنیان گونجاو بوو بۆ هاتوچۆی شارەکان هەستان بەئاگادارکردنەوەی هەقەکان بۆ بەشداری کردن لەشۆڕش ئەم کەسانەش کە بەوکارە هەستان بریتی بوون لە (حسێن حاجی محمد، محمد عبدالله سابوراوایی، شێخ ئیسماعیل مامە حسێن

گۆپتەپەیی) کە ئەوەبوو لەساڵی ١٩٨٧ بەئاگاداری بەڕێز (مام جەلال) (تیپی ٢٩ی کەڵکە سماق) دامەزرا کەخۆمان سەرتیپی تیپەکە بووین شەهید (سەعید حەمەشوان) جێگر بوو فەرماندەی کەرتەکانیش بریتی بوون لە (حەسۆ نەسرەدین کانی بی، ئیبراهیم أحمد أنور شوانی) ڕێکخەری تیپەکەش (ئامانج مام تەها) بوو دواتریش (کاك جەوهەراغا) و (کاك جەواد بێدەری) بەکەرتەکانیانەوە گوازرانەوە بۆلای ئێمە ئەم تیپە هەر لەسەرەتای پێکهاتنیەوە لەسنوری (مەڵبەندی دوو مەڵبەندی سێ) و شەڕی بەرگری لەسەرکردایەتی و بناری قەندیل بەشداری شەڕەکانی کرد کە لەماوەی چەند مانگێك لەدروستبوونی ٤٠ پێشمەرگەی بوونە قوربانی دوا چالاکی تیپەکەش شەڕەکەی (سورەدێ) بوو لە ١٩٨٨/٨/٣١ بەهۆی شۆڕش و بەشداری مامەڕەزاییەکان کە هەمیشە لەسەنگەری کوردایەتیدا بوون زۆرجار تووشی دەربەدەری وماڵوێرانی بوونەوە بەنمونە ماڵی کاکە حەمەی مامەڕەزاو خانەقاکەی تووشی چۆڵ کردن بووە لەحوزەیرانی ساڵی ١٩٦٣ بەهۆی بارودۆخی شەڕی گوندی کەلکە سماق چۆڵکراوە بەردەوامیش لەلایەن ڕژێمەکانی عێراق تۆپباران کراوە وە ماڵێ کاکە حەمەش چوەتە چیای کەلکە سماق لەنزیك (کلێسا) و ئەشکەوتی (کۆلەکە) لە (چیلان و هەنگەژاڵ) خانویان دروست کردووە لەساڵی ١٩٦٤ چوەتە گوندی (خۆشاوی مەرگە)، لە ساڵی ١٩٦٥ کە کەلکە سماق چۆڵ کراوەتەوە ماڵەکەی چوەتە گوندی (تۆربە– بناری کۆسرەت)، لەساڵی ١٩٦٧ جارێکی تر ئاوارەبوون بۆ (کانی بەهارە)ی نزیك گوندی (ئیللە لای کۆیەو) لەوێشەوە بۆ گوندی (مەلا سەفی– مەرگە)، لەساڵی ١٩٦٩ش تاساڵی ١٩٧٠ لەگوندی (تەنگژەی پشدەر) بوون، ساڵی ١٩٧٤یش کە شەڕ دەستی پێکردەوە ماڵی کاکە حەمە چووەتە گوندی الا الله و چەند مانگێك لەوێ بوون دواتر بۆ (کانی توی مەرگە) تا نشوستی شۆڕشەکە لەساڵی ١٩٧٥، ساڵی ١٩٨٦ یش کەڕژێمەکەی (صدام حسێن) دەستی بەوێرانکردنی گوندەکان کرد ماڵی کاکە حەمە ڕوودەکەنە گوندی (الا الله) و (بەری خاڵخالان) و گوندی (چوخلیجە) دواتر بۆ گوندی (قزلوی دەشتی کۆیە) تاوەکو ئەنفالەکە لەمانگی ٥ی ١٩٨٥ یش ڕوودەکەنە ئیران تا ڕاپەڕینەکەی ساڵی ١٩٩١ کە کاکەحەمە لەکاتی ئەنفالەکاندا بۆماوەی ١٥ ڕۆژ لەسنوری (خاڵخالان و شوان) لەگەڵ کۆمەلێك پێشمەرگەکانی تیپی ٢٩ ی کەڵکە سماق لەناوچەکە ماونەتەوە دواتر ڕووی کردۆتە ئێران .

## چارە نووسی باڵی مامەڕەزا

دوای کۆچی دوایی کاکە حەمەی مامەڕەزا لەسەرەتای ساڵی ١٩٩٨لەکۆبۆنەوەیەکی نێوان هەقەکاندا (شێخ هاوڕێ کاکە حەمە مامە ڕەزا) لەدایکبووی ١٩٥٩ بەهەڵبژاردن لەکۆبونەوەکەدا لەشوێنی باوکی دادەنرێت و خانەقاکەی کەڵکە سماق بەڕێوە دەبات کەوا وەك بەڕێز شێخ هاوڕێ بۆمانی باسکرد و گوتی:ئێستاکەش لەجەژنەکانی ڕەمەزان و قوربان لەهەقەکانی ناوچەکان و کەس و کاریان سەردانمان دەکەن.

**سەرنج:** دیارە بەڕێز (شێخ هاوڕێ)ش وەکو کەسێکی ئاین پەروەر پابەندە بە ئەنجامدانی نوێژ و ڕۆژوو.

## ٢- حــــەمــــە ســـــوريــــــەكـــــــان

١- حەمە سور و حەمە سوريەكان.

٢- نەريتى پەيڕەوەكانى حەمە سور.

٣- حەمەسور كێ بووە؟

٤- ڕەچەڵەك و شوێن و ساڵی لەدايك بوونی حەمەسور.

٥- بەشێك لەمێژووی گوندی شەشۆ-ی زێدی حەمەسور.

٦- كەسايەتی حەمەسور.

٧- دەزانم كەنازانم، وەڵامەكەی حەمە سوور بۆ مەلا مستەفا بارزانی.

٨- حەمەسور گوتويەتی: من پێغەمبەرم، بەڵام پێغەمبەری پەيڕەوەكانم.

٩- بەشێك لەمێژووی گوندی كلاَوقوت مەڵبەندی حەمەسوريەكان.

١٠- گوندی كلاَوقوت لەميانەی ئەنفالی سێ دا.

١١- بابەتی چانە خواردنەوەی حەمەسوريەكان.

١٢- بابەتی جگەرە نەكێشانی حەمەسوريەكان.

١٣- بابەتی منداڵ نەبونی حەمەسوريەكان.

١٤- بابەتی نوێژنەكردن و ڕۆژو نەگرتنی حەمە سوريەكان.

١٥- بلاَوكردنەوەی ديدارە ڤيديۆييەكەی ١٩٨٥/٩/٢٢ كەلەگەڵ حەمەسور و حەسەن جوبلاَغيدا كراوە.

١٦- كورتەيەك لەژيانی مامۆستاعباس عبدولڕەزاق.

١٧- دەقی ديدارە ڤيديۆييەكەی حەمەسور.

١٨- دەقی پەخشانە شيعری (هەقيقەت نامە) لەزمانی حەمەسور كە پەيڕە و و پڕۆگرامی هەقەی تێدا پوختەكراوە.

١٩- دەقی ديدارە ڤيديۆييەكەی حەسەن جوبلاَغی جێنيشينی حەمەسور.

٢٠- چاوپێكەوتنلەگەڵ تاتە حەلاو.

٢١- چاوپێكەوتن لەگەڵ زاواكەی حەمەسور.

٢٢- چاوپێكەوتن لەگەڵ ئەبوبەكر كلاَوقوتی.

٢٣- چارە نووسی زەوی و زاری حەمەسوور يەكان لە كلاَو قوت

٢٤- چارەنوسی باڵی حەمەسوری.

## حـەمـەسور وحـەمـەسوریـەکـان

حەمە سوور هەر لەسەرەتای سەرهەڵدانی بزوتنەوەی حەقە لەلایەن (شێخ عبدالکریمی شەدەڵە) بووە بە مریدی شێخ عبدالکریم و دواتر بووە بە یەکێ لە کەسایەتیەکانی ناو حەقە، لەدوای کۆچی دوایی کردنی شێخ عبدالکریم بە هۆی کێشەی جێگرتنەوەی شێخ عبدالکریم وەکو براگەورەیەك بۆ حەقەکان لەگەڵ بنەماڵەی شێخ عبدالکریم و مامەرەزادا دەکەوێتە کێشەوەو ناچار ڕوودەکاتە ناوچەی (شوان) و لە گوندی (کلاّو قوت) بە خۆیی و کۆمەڵێ لە لایەنگرەکانی بە ژن وپیاوەوە جێگیر دەبێ و دەست دەکەن بەکاری کشتوکاڵ و کڕینی زەوی و زار.

### نەریتی پەیڕەوەکانی حەمەسور:

– زۆربەی حەمەسوریەکان لە یەك ماڵدا لەگەڵ یەکتردا ژیاون و کارکردن و نان خواردن و ژیانیان پێکەوە بووە، پارەش لەناویاندا هاوبەش بووە .

–حەمەسورییەکان چاو جگەرەو منداڵبوونیان لە خۆیان قەدەغە کردووە.

–حەموسوریەکان دەستی یەکتریان ماچ دەکرد.

–بە یەکتریان دەوت خوشك وبرا .

–پیاوەکانی حەمەسوری ریشیان دەهیشتەوەو سەریان دەتاشی

–هاوینان هەندێکیان بۆ کشتوکاڵ کردن لە (کلاّو قوت) دەمانەوەو زستانانیش بۆ قەزوان کردن دەچون بۆ گوندەکانی جافایەتی.

–سالاّنە تەسبیحیان بەدیاری دەدا بە خەڵکی (قەرانگوێ) بە بێ جیاوازی.

### حەمەسور کێ بووە؟

حەمەسور کەساڵی لە دایکبوونی بەتەواوی نازانرێ، باڵێکی هەقەی جیاکردۆتەوە، لەبەدواداچونماندا دەرکەوت کە لە گوندی (شەشۆ)ی سەربەناحیەی(ماوەت) لە دایك بووە. لەتەمەنی هەرزەکاریدا دایك و باوکی مردوون و لای باپیرەی بەخێوکراوە، هەر لەو تەمەنەدا ڕووی کردۆتە گوندی (سورداش) و ئینجا پەیوەندی کردوە بە ماڵی (شێخ عبدالکریمی شەدەڵە) و لەوێ گیرساوەتەوە، لە ٤/ ١٢ / ١٩٨٦ کۆچی دوایی دەکات و لە (کلاّو قوت) بە خاك سپێردراوە، لەماوەی ژیانیدا چوار ژنی هێناوە، یەکەم هاوسەری (حەمدیە) بووە، کە لەسەردەمی شێخ عبدالکریم خواستویەتی و کوڕو کچێکی لێبووە بەناوەکانی (عەبدوڵلاو فاتیمە) کە کوڕەکەی لەعەسکەری و لەژێر نەشتەرگەری بە نەخۆشی دەمرێ، کچەکەشی لە ساڵی ١٩٣٨ لە دایك بووە و لە ساڵی ٢٠٠١ لە (سلێمانی) کۆچی دوایی کردووە، حەمە سور دوای لەدایك بوونی ئەو کچ و کوڕە لەگەڵ یەکەم هاوسەری جیا بۆتەوەو پاشان دوای ئەوە (حەمدیە) شودەکاتەوە بە (مام سەلیم هۆمەر قەومی سورداش) دووەم و سێیەم و چوارەم هاوسەری (حەمەسور)یش بریتی بوون لە (تەلحە حامید دەلۆ و خەجیج ئاو رەحمان سەرمۆردی و بەهێ)، کە سێیان دوای خۆی کۆچی دواییان کردووەو هیچ منداڵێکیان لەپاش بە جێ نەماوە، دوای کۆچی دوایی کردنی حەمەسور (حەسەن جوبلاّغی) شوێنی دەگرێتەوە، کەناوبراویش لە ساڵی ١٩٨٩ بەهۆی کارەساتی ئۆتۆمبێل لە (تەکیە)گیانی لەدەست داوەو لە گۆرستانی (پیریادییەکان) لە کۆمەڵگەی (شۆرش – چەمچەماڵ) بە خاك

سپێردراوە، (حەسەن جوبلاغی) یش لەماوەی ژیانیدا دوو هاوسەری هەبووە بەناوەکانی (سەفور خدرانی و ئامان مام برایم) کە ئێستاکەش (ئامان) لە ژیاندا ماوەو بەڵام بەهۆی نەخۆشیەوە لەسەر جێگەیە لە دوای ئەویش (عەبدوڵلا خەلیفە قوتانی) کە لە ١٦ / ١/ ٢٠٠٦ کۆچی دوایی کردووە و لەگۆڕستانی (پیریادی) کۆمەڵگەی (شۆرشی چەمچەماڵ) بەخاك سپێردراوە دەبێتە براگەورەی حەمەسوورییەکان. کە لە ماوەی ژیانیدا دووجار ژیانی هاوسەی پێکهێناوە، یەکەمجار لەگەڵ ئامۆزایەکی خۆی کە دواتر بەهۆی ئەوەی منداڵی لێی نەبووە لێی جیادەبێتەوە پاشان لەگەڵ (حەلاوە حسن مارف قەرانگوێ) ژیانی هاوسەری پێکهێناوە کەمنداڵیان نەبووە. لە دوای ئەویش و ئێستاکە لە باڵی حەمەسورییەکان تەنها پیاوێك بەناوی (ئەبوبکر کلاّو قوتی) و سێ ئافرەت ماون بەناوەکانی(حەلاوە حەسەن مارف قەرەنگوێ) هاوسەری (عەبدوڵلا خەلیفە قوتانی) و (ئامان برایم ئەحمەد جوبلاغی) هاوسەری (حەسەن جوبلاغی)، (مەلیح فتح الله کلاّو قوتی) هاوسەری (عبدالرحمن سەرمۆردی) کەوا (حەلاوە حەسەن مارف قەرانگوێی) وەك وتەبێژی حەمەسورییەکانە، ئەم سێ ژنە ئێستاکە لە کۆمەڵگەی (شۆرش) لە (چەمچەماڵ) و لەناو (پیریادییەکان) و لەگەڕەکی (کلاّو قوتیەکان) نیشتەجێن و ناسیاو و هاوسێیەکانیان بە تاتە واتا خوشکی گەورە بانگی (پورە حەلاو) دەکەن.

**سەرنج**: ئێستاکەش کەساڵی ٢٠١٨یە تەنیا (حەلاوە حەسەن مارف قەرانگوێیی) لە باڵی حەمەسووری لەژیاندا ماوە.

## ڕەچەڵەك و شوێن و ساڵی لەدایکبوونی ( حەمەسور )

**لەپەڕتوکی (ئاوڕدانەوەیەك لەبزووتنەوەی هەقە – مستەفا عەسکەری)لاپەڕە(٣١) و لەپەڕاوێزی ژمارە (٣١) لەزمانی (مەلا سەلامی ترێ خۆرەوە) لەبارەی حەمەسورەوە وتراوە:** باوکی ناناسم، باپیریشی ناناسم، باسیان ئەوەندە کردووەو وتویانە خەڵکی لای (ئالان و سیوەیلە) .

**لەپەڕتوکی (بۆ لە هەقە کەوتنە تەقە - ڕەئوف محمد زوهدی) و لەلاپەرە ١٢٨ و لەئاماژە بەژمارە (١٥)ی گۆڤاری کاروان، کانونی یەکەمی ١٩٨٣ لەنوسینی (ڕەشید محمد علی)دا هاتووە:** حەمەسور خۆی وتویەتی: کە خەڵکی دەوروبەری (ماوەت)م، لێرەشدا بەپێویستمان زانی دەقەکەی بخەینەڕوو بەمجۆرەی کەحەمەسور خۆی دەڵێ: خەڵکی دەوروبەر ماوەتم، چەند لەکلاّوقوت پرسیم نەیانتوانی بڵێن وایە یان وانیە، ئەوەندە نەبێ دەیانوت: یەك دوو جار پیاوێك هاتووە بۆلای بەمیوانی. دەیگوت: ئامۆزای حەمەسورم و خەڵکی ناوچەی (ماوەت)م .لێرەدا لەبەدواداچوونی ئێمە لە ژمارە (٥٠ی گۆڤاری شمشارە) لەزمانی (کاك جەبار هەمزە وەستا سەعید) بیستمان کە ئەم پیاوە باپیرەی (کاك جەبار) خۆی بووەو ئامۆزای (حەمەسور) بووەو هەتا شێوەو ڕوخساریشی زۆر لە حەمەسور چووەو جارێکیان کە بەئۆتۆمبیل چوو بۆ (کلاّوقوت) ئافرەتێکی کلاّوقوتی کە لەناو ئۆتۆمبیلەکەدا بووە پێی وتوە: کاکە بەراست پێم بڵێ تۆ برای حەمەسور نیت ؟ .

**– لە ژمارە (٩٨٨)ی ڕۆژنامەی (کوردستانی نوێ، ١٩٩٩/١٠/٣١ و لەبابەتی (حەمەسوری کلاّوقوت یەکێ لەرابەرانی بزووتنەوەی هەقە) نوسینی (فریاد شوانی)دا لەبارەی (حەمەسور کێیە)دا هاتووە:** حەمەسور ناوی (محمد أحمد محمود)ە، ناسراوە بە (حەمەسوری کلاّوقوت) لەساڵی ١٨٧٧ لەگوندی (شەشۆ) لەناوچەی (ماوەت) لە شاربازێر لەنزیك (ئاوەکورتێ) لەبنەماڵەیەکی زاناو ڕۆشنبیر چاوی بەژیان هەڵهێناوە .

**– لەژمارە (٣٥٣)ی ڕۆژنامەی (هەواڵ) ١٤ای تشرینی دووەمی ٢٠٠٩ داو لەبابەتی (بزووتنەوەی هەقەو حەمەسوری کەلاوقوت) نوسینی (عەدنان ئیبراهیم زەردکی) لەبارەی (حەمەسور کێیە؟)دا هاتووە:** ناوی (محمد علی ئەبوبەکر)ەو دایکی ناوی (حەنیفە ئەحمەدە)و لەساڵی ١٨٧٧ی زایینی لەگوندی (شەشۆ) لەشارباژێر لەدایك بووەو سەر بەهۆزی جافە، لەهەمان کاتدا بۆچونێکی تر هەیە دەڵێت: لەڕەچەڵەکدا خەڵکی ناوچەی(ئالان و سیوەیلە) .

ئێمەش لە ژمارە (٥٠ی گۆڤاری شمشارە) و لێرەدا چەند سەرنج و ڕوونکردنەوەیەکمان سەبارەت بەم نوسینانە هەیە کەلەبارەی ڕەچەڵەك و ناوی باوك و باپیر و شوێن و ساڵی لەدایکبوونی حەمەسور نوسراون کە بەم جۆرەیە:

١–سەبارەت بەخاڵی یەکەم کەوتراوە: خەڵکی ئالان و سیوەیلە ئەمەیان ڕاستە و گوندی (شەشۆ)ی زێدی حەمەسور کەوتۆتە ئەم ناوچە و سنورە .

٢– سەبارەت بەخاڵی دووەم کە لەزمانی حەمەسورە وتراوە: خەڵکی دەوروپشتی (ماوەت)م لێرەشدا مادام لەزمانی حەمەسورەوە گوتراوە ڕاستەو دیارە گوندی (شەشۆ)ش سەر بەناحیەی (ماوەت)ە .

٣– سەبارەت بەخاڵی سێیەم شوێن و ناوچەی لەدایکبوونەکەی ڕاستە، ناوەکەشی بەگوێرەی زنجیرەی بەرەبابی حەمەسور کەوا (جەبار هەمزە وەستا سەعید) یەکێ لەنەوەکانی ئەم بنەماڵەیە کەبۆئێمەی ئامادەکردووە هەر ڕاستە بەڵام دەبوایە نوسەر ئاماژەی بەو سەرچاوە کردبایە کەلێی وەرگرتووە جیا لەوەش سەبارەت بەساڵی لەدایك بوونەکەشی نەینوسیوە لەسەر چ بنەمایەك؟ و بەچ بەڵگەیەك؟ یان لەزمانی کێ؟ ئەم مێژووەی داناوە .

٤–سەبارەت بەخاڵی چوارەمیش ناوەکەی ئەگەر ئاماژە بەتۆماری دەفتەر نفوسەکەی بێ لەگەڵ ئەوەشدا ئاماژە بەسەرچاوەکەی نەکراوە بەهەڵەش تۆمار کراوە چونکە ناوەکەی لەدەفتەر نفوسەکەدا بە (حەمەسور علی ئەبوبکر) هاتووە، ناوی دایکیشی کە بە (حەنیفە ئەحمەد) هاتووە، بەگوێرەی دەفتەر نفوسەکەش هەروایە، کەنوسراویشە ساڵی ١٨٧٧ ئاماژەی نەکردووە بەوە کە لەسەر چ بنەمایەك؟ یان بەچ بەڵگەیەك؟ یان لەزمانی کێ؟ وەرگیراوە چونکە ئەگەر بەگوێرەی دەفتەرنفوسەکە بێ ساڵی لەدایك بوونەکەی حەمەسور ساڵی (١٨٩٠)ە، ناو و شوێنی لەدایك بوونەکەشی ڕاستە .

**لەبەدواداچوونەکەی ئێمەش لە ژمارە (٥٠ی گۆڤاری شمشارە) لەوبارەوە بەمجۆرەیە:**

أ–بەگوێرەی زنجیرەی بەرەبابەکەی حەمەسور کە لەلایەن (جەبار هەمزە وەستا سەعید) دەرچووی بەشی ئاژەڵداری کەنەوەی ئامۆزای حەمەسوریشە و ئێستاکە لەناحیەی (بازیان) نیشتەجێیە بۆ گۆڤارەکەمانی ئامادەکرد ناوی چواری حەمەسور بەمجۆرەیە: (حەمە سور أحمد صۆفی بابکر صۆفی علی) بەگوێری دەفتەر نفوسەکەش کەنوسخە سەرەکیەکانی لەلایەن کاك (بەختیار مەلا حسن) کوڕێ (فاتم)ی کچی حەمەسور بۆ گۆڤارەکەمان کرا بەدیاری دەفتەر نفوسەکە لە ١٩٦٢/٢/١٤ دەرچووە، بەناوی (حەمەسور علی ئەبوبکر)، دایکی (حەنیفە ئەحمەد)، شوێنی لەدایك بوون (سورداش – سلێمانی)، ساڵی لەدایك بوون ١٨٩٠/٧/١، شوێنی نیشتەجێبوون (شوان – کلاوقوت) .

**ڕوونکردنەوەی زیاتر:** وەکو (کاک جەبار هەمزە سەعید) باسی کرد، حەمەسور باوکی ناوی (ئەحمەدە سور) بووەو ئێستاکەش لەگوندی (شەشۆ) لوتکە شاخێك هەیە پێی دەوترێ (کلاوی ئەحمەدسوری) کەئاماژەیە بەباوکی حەمەسورو لەم ڕووداوەش سەرچاوەی گرتووە کەگوایە (ئەحمەدە سور) لەمازو چنین لەو لوتکە دەکەوێتە خوارەوە بەلام نەمردووە هەربۆیەش ئەو ناوەی بەسەردا براوە .هەروەها پارچە زەویەکیش لەگوندی (شەشۆ) کەموڵکی بەرەبابی ئێمەیە ناسراوە بە (زەویە گەورەی ئەحمەدە سوری) و جیا لەوەش ئەحمەدە سور کاری تەونی بزووی شاڵی ڕانك و چۆغەشی کردووە و دوای خۆیشی ئامێری تەونەکەی کەپێی دەوترێ (پێچاڵ) کەوتبوە لای (وەستا سەعید)ی باپیرم یەکێ لەئامۆزاکانی .

هەروەها بەوتەی بەڕێز (مەلا حسن مەلا کەریم صۆفی شەریف)ی زاواکەی حەمەسوریش، حەمەسور لەتەمەنی چوار بۆ پێنج ساڵی دایکی مردووە و لەتەمەنی حەوت بۆ هەشت ساڵیش باوکیشی مردووە و لای باپیرەی بەخێو کراوە تاتەمەنی چوارە بۆ پانزە ساڵی. لێرەشدا کاك (جەبار هەمزە وەستا سەعید) گوتی: لەو تەمەنەدا کوێخای گوندی (شەشۆ) کەناوی (کوێخا ڕەشید) بووە حەمەسور لەگەڵ خۆیدا دەبات بۆ (چوارتا) بەو بیانوە کەناوی سەربازی هاتۆتەوە و لەوێوە کوێخاکە بەڕێی دەکات بۆ (سورداش) کە کوێخاکە دەگەڕێتەوە باپیرەی حەمەسور پرسیاری لێ دەکات کە حەمەسور چی لێهات ؟ ئەویش دەڵێ: ڕەوانەی گەرمێنم کرد، لێرەشدا بەڕێز (مەلا حسن) زاواکەی حەمەسور دەڵێ: حەمەسور کە گوندی (شەشۆ) بەجێ دەهێڵێ دەچێتە لای باپیرەم (صۆفی شەریف) لە (سورداش) کەوا لەگەڵ باوکی حەمەسور خاڵۆزاو پورزا بوون و بەهۆی ئەوەش کەباپیرەم صۆفی شەدەڵەبووە چەندجار حەمەسوری لەگەڵدا بووە بۆ ماڵی (شێخ عبدالکریم) و شێخ عبدالکریم پێی دەڵێت: ئەم کوڕە کوڕێکی زیرەك و چالاك دیارە حەزدەکەم بێتە ماڵی ئێمە، باپیرەشم لەسەرەتادا دەڵێ ئاخر حەمەسور هەتیوەو حەزناکەم لەلام دوور کەوێتەوە، دواجار باپیرەم ڕازی دەبێ و حەمەسوور دەداتە دەست ماڵی (شێخ عبدالکریم).

لێرەدا: بەبۆچوونی ئێمە لە ژمارە(٥٠ی گۆڤاری شمشارە) بەگوێرەی زانیاریەکەی کەدەڵێ: حەمەسور لەساڵی ١٨٧٧ لەدایك بووەو هەروەها بەگوێرەی دەفتەر نفوسەکەی (حەمەسور)یش کە لەساڵی ١٨٩٠ لەدایك بووە ئەوا دەبێ حەمەسور تەمەنی لە (شێخ عبدالکریم) زیاتر بووەو بۆیەش دەگونجێ لەسەردەمی باوکی شێخ عبدالکریم دا پەیوەندی کردبێ بەشەدەڵەوە .

هەروەها سەبارەت بەساڵی لەدایکبوونەکەی حەمەسور:

أ- وەکو (کاك جەبار هەمزە وەستا سەعید) ئاماژەی پێکردووە بەهۆی ئەوە دەزانین کە ساڵی لەدایکبوونەکەی ١٨٧٧ە چونکە باپیرەم ساڵی ١٨٨٥ لەدایکبووە و گوایە حەمەسور دووساڵ لەئەو بچوك تر بووە.

ب- سەبارەت بەوەش کە لەدەفتەر نفوسەکەدا ناوی باوکی حەمەسور بە (علی) هاتووە سەرەتا (علی) یەکێك بووە لەمامەکانی حەمەسورو بەلام کاك جەبار و کاك بەختیاری نەوەی حەمەسوریش هۆکاری ئەوەیان نەدەزانی بۆچی لەجیاتی ناوی باوکی ناوی مامەی نوسراوە ؟

هەروەها (کاك جەبار هەمزە وەستا سەعید) باسی ئەوەشی بۆکردین ئەوکاتەی کە (حەمەسور) لەساڵی ١٩٥٧

دەگێرێ بۆ سۆراغی ڕەچەڵەکی بە بەندکراوی دەبرێت بۆ (چوارتا و ماوەت) و لە گوندی (شەشۆ) وەش (کوێخا محمدی دەورێشاغا) و (وەستا سەعیدی)ی باپیرەم و (محمودی مەلای) دەچن بۆ ئیسپات کردنی ئەوە کە (حەمەسور) خەڵکی (شەشۆ)یە .

## بەشێك لەمێژووی گوندی ( شەشۆ )ی زێدی حەمەسور سەر بەناحیەی ( ماوەت ) قەزای ( چوارتا )

**ناوەکەی:**

وەکو کاك جەبار هەمزە سەعید بۆمانی باس کرد: گوایە ناوەکەی لەوەوە سەرچاوەی گرتووە کە (شا ئیسماعیل—سەفەوی) بەو سنورەدا تێپەڕیوە کە پرسیاریان کردووە ئەوە کێ بوو ؟ وتراوە (شا شود) واتە (شا بوو) ئیتر لەوەوە گۆڕان بەسەر ناوەکەی دا هاتووەو بوە بە (شەشۆ) .

**بەرەبابەکانی گوندەکە:**

(مراداغا، مەلا ڕەش، مەلا عبدالرحمن، حەمەشین، ڕەسوڵی، صۆفی عەلی / کە حەمەسور سەر بەو بنەماڵەیە بووە) .

**ڕاگواستنی گوندەکە:**

**یەکەمجار:** لەمانگی ٩ ی ١٩٧٩ لەلایەن رژێمەکەی (ئەحمەد حسن بکر) ڕادەگوێزرێ و لەئۆردوگای (سورە قەڵات — ماوەت) نیشتەجێ دەکرێن .

**دووەمجار:** لەبەهار و مانگی ڕەمەزانی ساڵی ١٩٨٨ لەلایەن ڕژێمەی (سەدام حسێن) ڕادەگوێزرێ بۆناحیەی (بازیان) .

## کـەسێتـی حـەمـەسـور

**لەگۆڤاری (کاروان) ژمارە (١٥) کانونی یەکەمی ١٩٨٣ لەبابەتی (مەسەلەیەکی مەزن و هەوڵێکی کەم لاپەڕە (٦٨) — نوسینی ڕەشید محمد علی)دا هاتووە:** حەمەسور خۆی لەدوای شێخ عبدالکریم بەخاوەن ئەزانێ لەڕابەرایەتی بزووتنەوەکەداو خۆی زۆرجار وتویەتی: کەسوکاری شێخ غەدریان لێ کردم چونکە من بێ کەس بووم ئەوان داگیریان کرد بۆخۆیان ئەگینا دوای شێخ بۆمن دانرا بوو .

**محمدی مەلا کەریم کەپەراوێزی بۆ پەرتوکی (ئاوڕدانەوەیەك لەبزووتنەوەی هەقە لاپەڕە(٣١) لە پەڕاوێزی(٣١) — مستەفا عەسکەری) نوسیوەو دەڵێ:** حەمەسور لەبنەماڵەی شێخەکان نیە، ڕەشەمسکێنە، کاتی خۆی ماوەیەکی زۆر لەماڵی شێخ عبدالکریم دا دارکێش و گۆلکەوان بووە پاشان تەریقەتی وەرگرتووەو لەگەڵ صۆفی و مریدەکانی تردا هەستاوە و دانیشتووە و بەو جۆرە وورده وورده دەرکەوتووە تا بووە بەیەکێ لەپێشەوایانی هەقە .

**(مـەلا سـەلامی تـرێ خـۆر) لەدیدارەکەیـدا لەگـەڵ (شـێخ سـتار) دا لـەبارەی خوێنـدەواری و نەخوێنـدەواری حەمەسوریشەوە لە پەڕتوکی (ئاوڕدانەوەیەك لە بزوتنەوەی هەقە، لاپەڕە (٣٢) و پـەراوێزی (٣٤)دا دەڵـێ:** حـەرفی نەخوێندووە بەڵام شیعر و شتی زۆر لەبەرە، وەختـی خـۆی لەگـەڵ مـەلاو فـەقێ و شـتی وادا مناقەشـەی بـووە،

هەروەها محمدی مەلا کەریم دەنوسیٚ: تاقمەکەی حەمەسور لەناو تاقمەکانی هەقەکاندا لەهەموویان ناحەزیان زۆرتربوو . (مامۆستا هەمزە عبدالله) ش بەرەی حەمەسور بە بەرەیەکی چەپڕەوی هەقە دەداتە قەڵەم و دەڵیٚ: ئەم پیاوە لەوکاتەوە تاکو کۆچی دوایی کردنی سەرجەم پیاوێکی دڵسۆزو لایەنگری کۆڕو کۆمەڵە نیشتیمانپەروەرەکان بووە لاپەڕە (٣٣) و پەراوێزی (٣٥)، پاش کۆچی دوایی شێخ عبدالکریم کەدووبەرەکی مەترسی بۆ سەر بزووتنەوەکە چاوەڕوان لێدەکرا (مامە ڕەزا) بیر لەرێکخستەوەی بزووتنەوەکە دەکاتەوە کەئەوەبوو بیری لەدانانی (ڕەوشت) کردەوە کەبریتی بوو لە ڕێساو نیزامێك بۆ بەربەستی خراپەو دەستدرێژی، حەمەسور لەڕیزی پێشەوەی ئەوانەوە بوو کەبیریان لەمە کردەوە . لاپەڕە(٣٦) پەراوێزی (٣٨).

**پرۆفیسۆر (عیزەدین مستەفا ڕەسوڵ)لە لاپەڕە (٦٩)دا یش کەپاشبەندی بۆ پەرتوکی(ئاوڕدانەوەیك لەبزووتنەوەی هەقە – مستەفا عەسکەری) نوسیوە**، دەنوسیٚ: حەمەسور ڕابەری بەرەی (حەمەسوریی) هەقە لەگوندی (کلاوقوت) دەژی، حەمەسور لەپاڵ ساکاری و بەواتە نەخوێندەواری خۆیدا زۆر لەپەیڕەوەکانی خۆی لەشێوەی هەندیٚ شیعری سەربەکێشی فۆلکلۆردا باس دەکرد، لەوشتانەی لەبیرمن ئەوەبوو کە لەدێڕێکدا دەیگوت: (من خالیدی کوردم هەبیٚ بەلای کەسی تردا ناچم) دیارە مەبەستی لەخالید مەولانا خالیدە . لەشوێنێکیش کەباسی خۆی دەکات بە (ئەم دینە)ی ناو دەبا کە لەژوورووی ئایینی (نەوەویە) دیارە مەبەستی (ئیمامی نەوەویە) .

**هەروەها پرۆفیسۆر (عیزەدین مستەفا ڕەسوڵ) لە پاشبەندیەکەیدا لە لاپەڕە (٦٨ و ٦٩)دا نوسیویەتی:** کەوا چەند ڕۆژ پێش (١١ی ئازاری ١٩٧٠) سەردانی (کلاوقوت)م کردووە دەڵیٚ: لەهەقەکانی کلاوقوت (محمدی مەلا عوبێد)م لەهەموان بەدیمەن ترو وشیارتر هاتە پێش چاو ئەو زۆر قسەی بۆ کردم و دەیوت: ئەوەتەی ئێمە هاتووینە سەر ئەم دینە، بچوك پێش گەورە نەکەوتووە، کەس بەکەسی نەوتووە درۆ دەکەی، مڵك و ماڵمان کردووە بەیەك، تا بتوانین لە یەك مەنجەڵ نان دەخۆین. هەقەکان بەشەو کۆدەبوونەوە ئەرك و کاری سەبەینێیان لەنێوان ژن و پیاوی گوندەکەدا دابەش دەکرد. پارە لای حەمەسور بوو، دەیان ووت: ئەوی نەخۆش بیٚ پارەی دەداتیٚ و دەینێریٚ بۆشار، ئەوی ژنی نەهێنابیٚ ژنی بۆ دەهێنیٚ، ئەم بارە هەرەوەزیە لەو چەند گوندەدا کە سەر بە حەمەسور بوون حاڵ و بارێکی خۆشتری دروست کردبوو، پێش خەڵکی تر تراکتۆرو مەکینەی تری کشتوکاڵیان کڕیبوو هەمووی موڵکی گشتی بوو، ژیانیان لەخەڵکی تر ڕێك و پێك تر بوو . بۆنمونە سەرلەبەیانی (فاخیری حەمەداغای مێرگەسوری) ناردبووی بۆ تراکتۆرێك بۆشت گواستنەوە (حەمەسور) هاتە لای و وتی: کاك فاخیر لەمەودوا کەئیشتان بەتراکتۆر بوو سەر لەئێوارە ئاگادارمان بکەن، چونکە ئێمە شەو بڕیاری کاری بەیانی دەدەین .

## دەزانم کەنازانم، وەڵامەکەی حەمەسوور بووە بۆ مەلا مستەفا بارزانی

**پرسیار لە (ئەبوبکر کلاوقوتی):**

**دەڵێن: جارێك حەمەسور چوەتە لای مەلا موستەفا بارزانی دەکرێ باسی ئەوەمان بۆبکەی ؟**

وەڵام / بەڵێ لەساڵی ١٩٦٤ کاکە حەمە لە (سەرگەڵو) دەچێ بۆلای بارزانی و بارزانی پێی دەڵێ: ئێمەش لەسەر تەریقەتی نەقشبەندین و پرسیاری لێدەکات کە ڕات چیە لەبارەی ئەو شۆڕشە؟ کاکە حەمەش دەڵێ: "دەزانم کەنازانم!" دواتر بارزانی لە کاکە حەمەی شێخ عبدالکریمی شەدەڵە دەپرسێ حەمەسور قسەیەکی وای کردووە ئایا ئەو قسەیە هی خۆیەتی یان نا؟ کاکە حەمەی شێخ عبدالکریمیش دەڵێ: قسەی خۆیەتی، هەروەها لەکۆتایی دانیشتنەکە حەمەسور دەڵێ: عەدالەت و وەسەلام.

**هەروەها کاك (جەبار هەمزە وەستا سەعید) یەکێ لەنەوەکانی بەرەبابی حەمەسور ئاماژەی بەوە کرد:** کەساڵی ١٩٦٤ حەمەسور لەگوندی (قەرانگوێ) لەگەڵ بەڕێز (مام جەلال) سکرتێری گشتی (ی، ن، ك) و سەرکۆماری عیراق یەکتریان بینیوەو حەمەسور پێی گوتووە: نازانم کەی بەڵام شۆڕشەکەتان سەردەکەوێ و مەشبن بەدڕك بۆ میللەتەکەتان .

**هەروەها (کاك ئازاد أبوبکر کلاو قوتی) سەبارەت بە (حەمەسور) وتی:** یەکەم کەس کە لە (کلاو قوت و گەرمیان) ڕەزی ترێی چاندو بەرهەمی هێنا (حەمەسور) بووە هەروەها (دارەبەن – دارقەزوان)یشی چاندبوو بەڵام قەزوانی نەدەگرت، جیا لەوەش باخەکانی پڕبوون لەهەموو جۆرە میوەیەك و بەڕاستی (حەمەسور) لەبواری کشتوکاڵیشدا ئەزمونێکی زۆری هەبوو، هەروەها (کاك بەختیار مەلا حسن) نەوەکەی حەمەسوریش گوتی: پیشەی تەسبیح هۆنینەوە کەیەکێك بوو لەسەرچاوەکانی بژێوی کۆمەڵەکەی (حەمەسور) ئەوەندە پسپۆر بوون تێیدا کە کارەکەیان شێوەی کارگەیەکی بچوکی سەرەتایی دەنواندو ژن و پیاوەکانیش لەو پیشەیەدا بەشداربوون .

هەروەها (کاك ئازاد ئەبوبکر کلاوقوتی) دەیگوت: لەسەردەمی شۆڕشی نوێدا هەرجارێك پێشمەرگە کەهاتبنە گوندی (کلاوقوت) بەزۆری و زۆربەیان میوانی ماڵی (کاکەحەمە) بوون.

## حەمەسور گوتویەتی: من پێغەمبەرم، بەڵام پێغەمبەری پەیڕەوەکانم.

**(بابەکر عبداللە رسول مەلا سەفی)لەدایکبووی ١٩٥١ گێڕایەوە و گوتی:** لەساڵی ١٩٧٢ پێشمەرگە بووم لەلای (فەقێ حمدأمین مەرگەیی) لە (بەتالیۆنی (١) بابەگوڕ گوڕ – ی سەر بە هێزی ڕزگاری شۆڕشی ئەیلول) کە بارەگاکەمان لە (کارێزی خاڵخالان) بوو یەکێ لە ڕۆژەکانی هاوینی ئەو ساڵە ئامر بەتالیۆنەکەمان من و (قادر مەلا سەفی و مام ڕۆستەم– کە ئەوکات بە حسن) دەناسرا ناردین بۆ کلاوقوت و تەبلیغێکی دابووینە دەست بۆ (حەمەسور) کەپێویستە بێت بۆ لامان، ئێمەش بەسواری تراکتۆر چووین کە گەیشتینە کلاوقوت حەمەسور لەناو ڕەز و باخەکەیدا بوو کەنزیك کاتژمێر ٩ ی بەیانی بوو، قادری هەڤاڵمان بەهۆی ئەوەی کە لەئێمە گەورەتر بوو تەبلیغەکەی بە حەمەسور گەیاند ئەوەبوو حەمەسور لەگەڵ چوار کەسی تر لەکۆمەڵەکەی یەکسەر لەگەڵمان هات کە بۆ نیوەڕۆ گەیشتینەوە بارەگاکەمان، ئامر بەتالیۆنەکەمان بە حەمەسوری گوت: پرسیارێکت لێدەکەم

بەڕاستی وەلاٌم بدەوە، حەمەسور گوتی: بەسەرچاو، ئامر بەتالیۆنەکەمان گوتی: دەڵێن گوتوتە (من پێغەمبەرم)، حەمەسور گوتی: بەڵێ وام گوتووە بەلاٌم نەمگوتوە پێغەمبەری ئاخر زەمانم بەڵکو پێغەمبەری ئەم صۆفیانەم کەمەبەستی لەوکەسانەبوو کە لەگەڵی بوون، ئیتر دوای نان خواردن ئەوەبوو حەمەسور گەڕایەوە کلاٌوقوت .

**پرسیار**/ وەك بزانی ئەو تەبلیغە لەلایەن خودی ئامر بەتالیۆنەکەتان دەرچووبوو یان ئامر هێزەکەتانەوە بوو ؟

**وەلاٌم** / نازانم ؟

## بەشێك لەمێژووی گوندی ( کلاٌوقوت )ی سەر بەناحیەی ( ڕێدار )ی ناوچەی شوان

**ناوەکەی:** لەگوندەکە قەلاٌتێکی شوێنەواری هەیە کەگوایە ناوەکەی لە (قەلاٌقوت)ەوە سەرچاوەی گرتووەو دواتر بووە (کلاٌو قوت) یان (کولاٌو قوت) .

## چۆڵ کردن و ڕاگواستن :

١–لەپاییزی ساڵی ١٩٦٣ لەترسی حەرەس قەومیەکان و جەیش و جاشی ڕژێمەکەی (عبدالسلام عارف) خەڵکەکە گوندە چۆڵ دەکەن، کە هەندێك لەخانوەکانیان دەسوتێنن، حەمەسورو کۆمەڵەکەشی ئەوکات ڕۆشتبوونە گوندی (قەرانگوێی جافایەتی) .

٢– لە ١٩٨٨/٤/٢٠ دوا ڕۆژی (ئەنفالی سێ) گوندی کلاٌوقوتیش چۆڵ دەکرێ لەترسی ئەنفال کردن و خەڵکەکەی ڕوو دەکەنە چەمچەماڵ و رژێمەکەی (صدام حسێن) تێکڕای گوندەکە وێران دەکات و کەلوپەلی جێماوی خەڵکەکەش بەتالاٌنی دەبات .

## گوندی کلاٌوقوت لەمیانەی شالاٌوی ( ئەنفالی سێ ) دا

**(تاتە حەلاو حسن مارف قەرانگوێیی) ڕێبەری پاشماوەی حەمەسوریەکان بۆی باس کردین و گوتی:** چەند ڕۆژ پێش شالاٌوی ئەنفالەکە بۆ کلاٌوقوت (مەلا عبدالله ی قەلاٌ سێوکە) کە دۆستمان بوو کەسێکی دڵسۆزیش بوو بۆ خەڵکەکە هات بۆ لامان و بەچاکە پێی گوتین: واباشە هەرچی زووتر دێیەکەتان چۆڵ بکەن و بچنە ناو حکومەت بەلاٌم خەڵکی دێیەکە گوێی بەقسەکانی نەدا و خەڵکەکە لەبەینی خۆیان گوتیان: ئەگەر حکومەت هێرشیشی کرد دەچینە ناو باخەکانمان لەوێش کونە تەیارەمان هەبوو، ڕاستی پێشمەرگەش دەیان گوت: هیچ نابێت، شەوی پێش ڕۆژی ئەنفالەکە فیرارەکانی گوندەکە بەخەڵکەکەیان ڕاگەیاند کە بەیانی جەیش هێرش دەکات و ژن و منداڵەکان دەربچن و ڕوو بکەنە چەمچەماڵ. ئێمەش لەدێیەکە دەمێنینەوە. ئیتر ئەوەبوو ئەو شەوە ژن و منداڵی دێیەکە بەگشتی بەرەو چەمچەماڵ کەوتنە ڕێ، لەڕەبایەکانی حکومەتیش تەقەیان لێ دەکردین، پیاوەکانیشمان هەر لەدێیەکە مابوونەوە کەبۆ بەیانیەکەی ئەوانیش بەرەو چەمچەماڵ دەکەونە ڕێ، ماڵی (صالح یونس) بەژ ن و کوڕ و کچ و منداڵەکانیان لە (دارە قوتە ی مۆرخواردەی ناوچەی قەلاٌسێوکە) لەلایەن سوپا دەستگیر دەکرێن و ئەنفال دەکرێن، فیرارەکانیش هانا دەبەنە بەر مستەشارەکان و ئەوانیش پێیان دەڵێن سەرو چەکێك بۆخۆتان

بکڕن و لای ئێمە بن کەماوەیەکیش بەهەندێکیان دەوامی ڕەبایەیان پێ دەبینن، دواتر لەمنەزەمەی چەمچەماڵ تەسلیم دەکرێن و ناونوس دەکرێن و لەوکاتەوە بێ سەرو شوێنن .

## بابەتی چا نەخواردنەوەی حەمە سوریەکان

**لەگۆڤاری (کاروان) ژمارە (١٥) کانونی یەکەمی ١٩٨٣ لەبابەتی (مەسەلەیەکی مەزن و هەوڵێکی کەم – نوسینی ڕەشید محمد علی)لە لاپەڕە (٦٨و ٦٩ )دادا هاتووە:** بەلام حەمەسور لەباسی چا نەخواردنەوەکەیدا دەڵێ: ڕۆژێکیان کۆمەڵێکی صۆفی و شێخان لەتەکیە کۆبوونەوە، منیش چوومە ژوورەوە گوێم لێبوو شێخ دەیفەرموو: مریدی من نابێ چا بخواتەوە. منیش واتە حەمەسور بەدەنگێکی بەرز قیژاندم و وتم من دەیخۆمەوە، شێخیش فەرمووی: شێتە ! لەگەڵ تۆم نیە. کەواتە بەپێی ئەم قسەیەی حەمەسور چا خواردنەوە هەر لەسەردەمی شێخ عبدالکریم خۆیدا قەدەغەکراوە. بەڕای حەمە سور ئەوانەی چا دەخۆنەوە لەپەیڕەوکەرانی ڕێبازی هەقە سەرپێچی لەفەرمانەکەی شێخ دەکەن. حەمەسوریەکان ئێستاش هیچ کامیان چا ناخۆنەوە، هەرچەندە هەمووکات چا لەماڵیاندا بۆمیوان ئامادەیە، ئەم مەسەلەی چا نەخواردنەوەیە کەلای حەمەسوریەکان هەیە لای هیچ کەسی تر لەشێخان و صۆفی مریدەکانی تری بزووتنەوەی هەقە نەمدیوەو نەمزانیوە کەسیان هەبێ چا نەخواتەوە .

**(حسن جوبلاغی) جێنشینی دوای حەمەسور لەدیدارە ڤیدیۆییەکە کەبەڕێز (مامۆستا عەباس عبالرزاق) لە ٢٢/ ٩/ ١٩٨٥ لەگەڵیدا ئەنجامیداوە لەوەلامی چا نەخواردنەوەی حەمەسوریەکاندا دەڵێ:** وەختی خۆی کەچامان تەرک کردووە ئەوە چەندساڵە .

**پرسیار** / بەبڕیاری شێخ تەرکتان کردن یان هەر خۆتان تەرکتان کرد چا ؟

**وەلام** / بەخوا وەختی خۆی شێخ قسێکی فەرموو، شەکرو چا گران بوو بوو، شێخ مابوو گوتیان وەلا گران بووەو نەیخۆین و پارە کەم بوو، شێخ فەرمووی نا ئێمە هەتا دەبێتە ڕوبعێك دەیخۆینەوە لەوە بەولاوە نایخۆینەوە، ئەو وەختە کە کەللەی بوو بە ڕوبعێك ئێمە لەسەر ئەم ئەمرە نەمان خوارد تەرکمان کرد .

## بابەتی جگەرە نەکێشانی حەمەسوریەکان

**(حسن جوبلاغی) جێنشینی دوای حەمەسور لەدیدارە ڤیدیۆییەکە کەبەڕێز (مامۆستا عەباس عبالرزاق) لە ٢٢/ ٩/ ١٩٨٥ لەگەڵیدا ئەنجامیداوە لەوەلامی پرسیاری ئەوە کەئایا ئێوە بۆچی چای و جگەرەتان تەرك کردووە ؟ دەڵێ:** زوو زەمانی خۆی جگەرەمان کە تەرك کرد کەشێخ وەفاتی کرد جگەرەمان نەخوارد لەدوای وەفاتی شێخ.

**پرسیار / شێخی گەورە ؟**

**وەلام / شێخی گەورە شێخ عبدالکریم**

## بـــابــەتـــی مـــنـــداڵ نـــەبـــوون لای حـــەمـــەســوریـــەكـــان

**لەگۆڤاری (كاروان) ژمارە (١٥) كانونی یەكەمی ١٩٨٣ لەبابەتی (مەسەلەیەكی مەزن و هەوڵێكی كەم – نوسینی ڕەشید محمد علی)دا هاتووە:** ئەم مەسەلەیە كەلای ئەمان هەیە واتە مەسەلەی منداڵ نەبوون لای حەمەسوریەكان، لای هیچ كام لە بەشەكانی تری هەقەو هیچ تاقم و كۆمەڵ و تایەفەیەك لەوڵاتی خۆمان نەمبیستووە هەبێت، ئەو كۆمەڵەی بەیەكەوە دەژین كەبریتیتن لەپیاوو ژن منداڵیان نابێت . لەحەمەسورم پرسی كەهۆی چیە منداڵیان نابێت ؟ وتی: ئێمە خۆمان ناهێڵین منداڵمان ببێت، بەپێی فەرموودەی خوای گەورە كە لەقورئانی پیرۆزدا دەفەرموێ: (وَاعْلَمُوا أَنَّمَا أَمْوَالُكُمْ وَأَوْلَادُكُمْ فِتْنَةٌ) حەمەسوریەكان هەروەك خۆیان منداڵیان نابێ حەزیش ناكەن منداڵی كەسی تریان لەماڵ لێ نزیك ببێ یا لەگەڵیان بژین .

(حسن جوبلاّغی)ش جێنشینی دوای حەمەسور لەدیدارە ڤیدیۆییەكە كەبەڕێز (مامۆستا عەباس عبالرزاق) لە ١٩٨٥/٩/٢٢ لەگەڵیدا ئەنجامیداوە لەوەڵامی پرسیاری ئەوەی كەئایا ئێوە بۆچی مەنعیمناڵ وشتتان كردووە ؟

**حسن جوبلاّغی** / مەنعی مناڵ و شتی وا ؟

**عەباس عبالرزاق**/ بەڵێ.

**حسن جوبلاّغی** / مەنعمان نەكردووە. مەنعی منـاڵ و شـتمان بـۆ كـردووە؟ ئێسـتا ئـەوە منـداڵمان گـەورە دەبـن پێمان ڕەزا نابن دەچن بۆخۆیان لەم شارانە و لەم هینانە. ئێمە چونكە بەواستەی تەریقەتەوە پێكەوەدانیشتوین منداڵیش تەریقەت نازانێ كە گەورەبوون لێمان جیا دەبنەوە دەڕۆن .

## بـــابـــەتـــی نوێـــژ نـــەكـــردن و ڕۆژوو نەگـــرتـــنـــی حـــەمـــەسوریـــەكـــان

**لەگۆڤاری (كاروان) ژمارە (١٥) كانونی یەكەمی ١٩٨٣ لەبابەتی (مەسەلەیەكی مەزن و هەوڵێكی كەم – نوسـینی ڕەشید محمد علی)دا هاتووە:** بۆ مەسەلەی نوێژ نەكردنیش ئەوەندەی من لەوێ ئاگـام لێبـوو نوێـژیان نـەدەكرد . خەڵكی دێی (كلاّوقوت) ئەیان وت: تا ماوەیەكی زۆر نوێـژیان دەكـردوو ڕۆژوویشـیان دەگـرت و هـەموو ڕۆژانێكـی هەینی بەشداری نوێژی هەینیان دەكرد، زۆرجار لەبەری باخەكانی خۆیان میوەیـان دەهێنـا بۆئـەوەی خەڵكەكـە دوای نوێژ بیخۆن. بەڵام ئێستا حەمەسور نوێژ ناكات، لێم پرسی بۆ نوێژ ناكەی ؟ لەوەڵامدا وتـی: مـن دەزانم بـۆ نوێژ ناكەم، ئەوانەی نوێژیش دەكەن دەزانن بۆچی دەیكەن .

**هەروەها لەپەرتوكی (بۆ لەهەقە كەوتنە تەقە) نوسینی (ڕەئوف محمد زوهدی)لە لاپەڕە (١٨)دا هاتووە و دەڵێ:** ڕاستە هەقەكان وەكو خاوەن تەریقەت كلاسیكیەكان ڕۆمانسی نەبوون كە هەر بەبابەتی (ذكر و فكر) ەوە خەریك .. سا بەشكو پێبگەن و بچنە ڕیزی (نیرڤانا) وە ئیتر پێویستیان بەتفاقی دنیایی نەمێنێ ! لەم دواییەدا صۆفیەكی هەقەم دواند و لێم پرسی: ئێوە خاوەن تەریقەتن كەچی لە بەئەنجام گەیاندنی داب و دەستوری ئاییینیدا كەمتەرخەمن بۆیە لەگشت لایەكەوە پەلامار دەدرێن .. ! كابرای هەقە گەرچی بێ سەوادیش بوو بەڵام بەڵگەو بەهانەكەی ڕاستیەكی تێدابوو وتی: كەسی كاكی وەكو دەیزانیت (دنیا) پێش (قیامەت) كەوتووە لێپرسینەوە لەقیامەتدا لەسەر كردەوەی ئەم دنیایەمانە .. ئەگەر لێرە كردەوەمان خراپ بێت، ئیتر لەوێ

بەتەمای چی بین .. !؟ ئینجا لەبابەت نوێژ و ڕۆژوەوە ووتی: ئەم دوو پەیڕەوە لەنان بەستەزمان ترن هەموو کەسێك پێیان دەوێرێت، دەتوانێت بیانکات، گەرچی بەڕواڵەت وسەرزارەکی یان بۆ چاوبەست بێت، خۆ ئەگەر کەسێك ڕەوشت و کردەوە خراپ و بەد بێت، ناشیرینە بەسەر تێکردنی ئەو دوو پەیڕەوەوە خۆی هەڵکێشێت، کە ئەنجامەکەی دەبێتە سوکایەتیەك دەربارەیان چونکە ڕەوشت نزمێك دەیکات بەکوتەکی دەستی و نان و پیازی پێوە دەخوات. هەروەها **پرۆفیسۆر (عیزەددین مستەفا ڕەسولٚ) لەپاشبەندی دووەمی کتێبی (ئاوڕدانەوەیەك لەبزووتنەوەی هەقە – مستەفا عەسکەری) لە لاپەڕە (٦٧)دا دەڵێ:** ساڵی ١٩٤٥ یان ١٩٤٦ بوو عەسرێك باوکم (مەلا مستەفای حاجی مەلا ڕەسولٚ – سەفوەت) لەسەر سەکۆی مزگەوتەکەی خۆمان (مزگەوتی حاجی مەلا ڕەسولٚ) کە بەمزگەوتی (باش چاوەش)یش ناودەبرا لە (سلێمانی) لەجێی گۆڕەپانی ئێستای لای حەمامی (نالی)دا بوو دانیشتبوو لەوە دەچوو چاوەڕێی میوان.

بێت ئەوەندەم زانی (مامە ڕەزا) هات (مەلا سابیر)و پیاوێکی تری لەگەڵدا بوو، باوکم بەڕێزلێگرتنێکی زۆرەوە پێشوازی کرد، ئەوەی لەبیرمە: مامەڕەزا ڕووی کردە باوکم و وتی: مەلا مستەفا تۆ نەوەی مەولانا خالیدی بۆ تۆ نەدەشیا ئەو قسانە بەئێمە بڵێی . باوکم وەلأمی دایەوە وتی: مامە ڕەزا ئێوە دەبێ حوکمی ئیسلامتان بەسەردا بدرێ .

مامەڕەزا وتی: بۆچی ئێمە مسوڵمان نین ؟

باوکم وتی: مسوڵمان چۆن تەرکی نوێژ دەکات و بەموریدەکانی دەڵێ نوێژ نەکەن ؟

تەواو وەلأمەکەی مامەڕەزام لەبیرە کەوتی: مامۆستا خوا فەرمویەتی (وَاعْبُدْ رَبَّكَ حَتَّىٰ يَأْتِيَكَ الْيَقِينُ) "حتی" ئەداتی بلوغی غایەیە، ئێمە گەیشتوینە غایە، یەقینمان پەیدا کردووە ئیتر پێویست بەعیبادەت نیە .

(حسن جوبلأغی) جێنشینی دوای حەمەسور لەدیدارە ڤیدیۆییەکە کەبەڕێز (مامۆستا عەباس عبالرزاق) لە١٩٨٥/٩/٢٢ لەگەڵیدا ئەنجامیداوە لەوەلأمی پرسیاری ئەوە: ئێوە نوێژو ڕۆژوو ناکەن ؟

**حسن جوبلأغی:** بەڵێ هەیە دەیگرێ و هەیە نایگرێ، بۆ خۆ.

**پرسیار:** بەقەناعەت، قەناعەتتان چۆنە بۆ نوێژو رۆژوو؟

**حسن جوبلأغی:** چیە؟ قەناعەتمان ئەوەیە دەڵێین نوێژو رۆژو ئەگەر نەیگری خراپە .

**پرسیار:** فەرز نیە لای ئێوە؟

**حەمەسور:** ئەوی دەڵێ وانیە کەرە .

**حسن جوبلأغی:** ئەرێ وەلا ئەوەی نەڵێ فەرز نیە پێمان کافرە . ئەوە ئەصڵی خۆی (حاکم معتەصەم) هەبوو لەکن عالەم دەیگوت ئەم پیاوە واتە (حەمەسور) ئیدیعای پێغەمبەرایەتی دەکات و جا ئەمەیە بلأو بۆتەوە، خۆی (معتەصەم) بلأوی کردەوە بۆخاتری ئەوەی لەحکومەت موتەهەم ببێ .

**بلاّو كردنەوەی دیدارە ڤیدیۆییەكەی حەمەسور و حسن جوبلاّغی كە لە ١٩٨٥/٩/٢٢ لەگەڵیاندا ئە نجام دراوە**

ئەم دیدارە ڤیدیۆییە كە نوسخەیەكی دەست ئێمە كەوتووە لەئێوارەی رۆژی ٢٢/ ١٩٨٥/٩ ئەنجامدراوە وەكو بەرێز (مامۆستا عەباس عبالرزا)ق بۆی باسكردین ئەو رۆژە (تیپی ٢١ ی كەركوكی پێشمەرگەكانی (ی، ن، ك) لەگوندی (كلاّوقوت) بووین و میوانی ماڵی حەمەسور بووین، من وێنەی دیمەنی دیدارەكانم بەئامێری ڤیدیۆكەم وێنە گرتووە، ئەو پرسیارانەی كە لە حەمە سورو حسن جوبلاّغیش كراون شەهید (شەوكەتی حاجی موشیر)و من و (مام ئاران)و پێشمەرگەی تریش لەگەڵدابوون .

**ئێمەش لە ژمارە(٥٠)ی گۆڤاری (شمشارە) چۆن كۆپیەكی ئەم كاسێتی ڤیدۆییەمان دەست كەوتووە ؟**

ئێمە لەشمشارە برادەرێكمان بەناوی (كاك وریا أحمد) كە ماڵیان لە (چوارقورنە)یە بیستمان كەوا كاسێتێكی ڤیدیۆیی ساڵی ١٩٨٥ تایبەت بە (حەمەسور) و هەقەكان لەماڵی دۆستێكمان لەناحیەی (حاجیاوا) هەیە كە ناوبراو داوای لەدۆستەكەیان كردبووو كەكۆپیەكی ئەو كاسێتەمان بداتێ ماڵیان ئاوابێ ئەم دۆستەشیان بێ بەرامبەر لەرێگەی كاك وریاوە ئەو كاسێتەی پێشكەش كردین، لەلای خۆمانەوە سوپاسی هەردوولایان دەكەین، ئەو كاسێتە ڤیدیۆییە كەوا لەلایەن پێشمەرگەكانی (یەكێتی نیشتیمانی كوردستان) لە ١٩٨٥/٩/٢٢ لەگوندی (كلاّوقوت) وێنە گیراوە، لەنێویدا چاوپێكەوتنێك لەگەڵ (حەمەسورو حسن جوبلاّغ) ئەنجامدراوە، هەروەها دیمەنی گێرە بەجەنجەڕ و شوانێك كە دووزەلە لێدەدات و بەلەمەوانێك كەپێشمەرگە لەروبارێك بە كەڵەك دەپەڕێنێتەوە و قسەكردنی دوو لەفەرماندە ناسراوەكانی (تیپی (٢١)ی كەركوكی یەكێتی نیشتیمانی كوردستان) كەئەوانیش بریتین لە كۆچ كردوو (شەوكەتی حاجی موشیر) و بەرێز (مام رۆستەم) بۆپێشمەرگەكان، كە لە پاڵ ماڵی (حەمەسور) كۆبوونەوەكە ئەنجام دراوە لەناو ئەم كاسێتەدا تۆماركراوە، ئەم كاسێتەش لەلایەن بەرێز (مامۆستا عباس عبدالرزاق أكبر) ناسراو بە (عەباس عبالرزاق) وێنە گیراوە، هەرلێرەشەوە پێویستە ئاماژە بەوەش بكەم كاتێك كەئێمە ئەم كاسێتەمان دەستكەوت پێشەكی هەستاین بەگەڕان بەدوای ئەوەدا كەكێ ئەم كاسێتەی وێنە گرتووە؟ دوای سۆراغ بۆمان دەركەوت كە بەرهەمی بەرێز (مامۆستا عەباس عبالرزاق)ە هەربۆیەش بەپێویستمان زانی سەردانی بەرێزیمان كردوو چیرۆكی دەستكەوتنی ئەم كاسێتەمان پێ ڕاگەیاند، ئەویش ماڵی ئاوابێ وتی: دەڵێن ئەم كاسێتەم دەست خەڵكی تریش كەوتووە بەلاّم مادام تۆ هاتوویت و پێت ڕاگەیاندین و داوای مۆڵەتی بلاّوكردنەوەم لێدەكەی بەخۆشحاڵیەوە ڕێگەتان پێدەدەین و زانیاری تریشتان لەبارەی حەمەسور هەقەكان پێ دەدەین . ئێمەش لەلای خۆمانەوە ئەوپەڕی سوپاس و پێزانینمان بۆ بەرێزیان هەیە و بەهۆی ئەوەش كە (مامۆستا عەباس عبالرزاق) لەماوەی ژیانی پێشمەرگایەتیدا لەشاخ وێنەی زۆرێك لەڕووداوو چالاكیی و دیمەنەكانی كوردستانی بەكامێرای (فۆتۆگراف) و (ڤیدیۆ) وێنە گرتووە بەپێویستمان زانی كورتەیەك لەژیانی بلاّو بكەینەوە.

## كورتـەيـەك لـەژیـانـی (مامۆستا عەباس عبدالرزاق اكبر) ناسراو بە (عەباسی ڤیدیۆ)

مامۆستا عەباسی ڤیدیۆ کەناوی تەواوی (عەباس عبدالرزاق أکبر)ە و ئێستاکە بەڕێوەبەری (بەڕێوەبەرایەتی گشتی رۆشنبریی و هونەری سلێمانیە) ناوبراو لەساڵی ١٩٤٩ لە (خانەقین) لەدایك بووە، خاوەنی بڕوانامەی (بەکالۆریۆس)ە لەڕاگەیاندن، کە لەتەمەنی ٥٤ ساڵیدا ئەم بڕوانامەیەی بەدەستهێناوەو پێشتریش قۆناغی سەرەتایی و ناوەندی لە (خانەقین) و ئامادەیی لە (کەرکوك) تەواو کردووە، لەساڵەکانی ١٩٧٢ – ١٩٧٤ بووە بە (پێوەر – مساح) لە فەرمانگەی (ئاوی بەغدا)، لەسەر دامەزراندنی (تیپی تاڤگەی هونەری) سەر بە (یەکێتی لاوانی کوردستان) و لەساڵی ١٩٧٢ نمایشکردنی شانۆگەری (ڕێگای ئازادی) کە لەنوسین و دەرهێنانی خۆی بووە هەروەها بەهۆی ئەوەی کەشانۆی گەڕۆکیشی بۆ لادێیەکان بردووە لەلایەن حکومەتی عیراقیەوە فەرمانی دەستگیرکردنی تەواوی ئەندامانی تیپەکە دەردەچێت، بۆیە ناچار ناوبراو دەچێتە ژێرباڵی شۆڕشەکەی کوردستان و لە (چۆمان – ی باڵەکایەتی) تیپێکی هونەری پێکدەهێننەوە بەناوی (مەهاباد) .

لەمیهرەجانی یەکەمی کوردی کە لەساڵی ١٩٧٤ لەبەغدا بەڕێوە دەچێت وێڕای فەرمانی دەستگیر کردنیـان بـەڵام تیپەکەیان تیپی (تاڤگەی هونەری) دەتوانێ بەشداری میهرەجانەکە بکات و پلـەی یەکـەمیش بەدەسـت دەهـێنێ بەشانۆگەری (ڕێگای ئازادی)، هەر لەونێوەشدا کۆمەڵێ بەرهەمی تر (لەخانەقین) و (بەغداد) پێشـکەش دەکـەن، هاوکات کە فەرمانبەری ئاوی بەغدا دەبـێ بەشـداری لـەخولی ڕاهێنـانی شـانۆیی دەکـات کـەبۆماوەی سـێ مـانگ لەلایەن مامۆستایان (یوسف ئەلعانی، سامی عبدالحمید، قاسم محمد، أسعد عبـدالرزاق) کـە وانـە شـانۆییەکانیان لەم خولەدا دەوتەوە، هەر لەوکاتەشدا خۆلیای بەکارهێنانی کامێرای دەکەوێتە سەر ، دوای چوار سـاڵی ئاشـتی لەکوردستان ساڵی ١٩٧٠ – ١٩٧٤ بەهۆی پابەنـد نـەبوونی حکومـەتی عیراقـی بەجێبـەجێ نـەکردنی بەنـدەکانی (بەیاننامـەی ١١ی ئـازاری ١٩٧٠) شـەڕ لـە کوردسـتان لـەنێوان شۆڕشـی ئـەیلول و حکومـەتی عیراقـی دەسـتی پێکردەوەو بەو هۆیەشـەوە کەسـوکاری مامۆسـتا عـەباس لەخانـەقین دەردەکـرێن و دەسـتیش دەگـیرێ بەسـەر خانوو خاوەنداریەکانیان و ناچار ڕوو دەکەنە ناوچەکانی ژێـر دەسـەڵاتی شۆڕشـەکە و مامۆسـتا عەباسـی ڤیـدیۆ لەگەڵ دایك و بـاوك و ماڵەوەیانـدا لـە(چـۆمانی باڵەکایـەتی) دەگیرسـێنەوە تـا نسـکۆی شۆڕشـەکە لـەمانگی ٣ی ١٩٧٥ هەر لەوێ دەمێننەوە، دوای ئەوە لـەئۆردوگای (ئـەنزڵ) ی (کرماشـان) جـێگیر دەبـن، لـەوێش ئەنـدامانی تیپەکەیان کەوا زۆربەیان لەو ئۆردوگایە دەبن درێژە بەکاری هونەری خۆیان دەدەن، لەو نێوەشدا پەیوەندی بـە (ڕادیۆی کوردی کرماشان) ەوە دەکـەن و ئامـادەیی دەردەبـڕن کەزنجیرەیـەك تەمسـیلی بـۆ تۆمـار بکـەن، بـەڵام بەهۆی هۆکاری سیاسی ڕێگە بەبڵاوکردنەوەو پەخش کردنیان نادرێت، ئینجا (مامۆستا عەباس عبالرزاق) بـەهۆی ئەوەی کە لەگەڵ دەزگای فریاگوزرای (شـیرو خورشـیدی – ئـیران)ی ئـەوکات کـاری کـردووە دەگوازرێتـەوە بـۆ (ئیسفەهان)، لەوێش بەهۆی بوونی یانەیەکی سـینەما لەشـارەکە پەیوەسـت دەبێـت بـەکاری وێنـە سـینەمایی و سینەما دەبێتە خولیایی و لەگەڵ تیپێکی بەناوبانگی ئەوێ بەناوی (الحام صدر) دەسـت بـەکار دەبـێ، لەسـاڵی ١٩٧٩ لەسەر پێشنیاری (کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان – ی شاخ) مامۆستا (عەباس عبـالرزاق) دەگەڕێتـەوە کوردسـتان و لەشـاری (سـلێمانی) نیشـتەجێ دەبێـت و لەناوەوەشـدا لـەکاری سیاسـی بـەردەوام دەبێـت. دوای

بەشداری کردنیشی لە (کۆنفرانسی یەکەمی (کۆمەڵە) کە لە (مالیمۆس)ی شاخ بەڕێوە دەچێ و دوای گەڕانەوەی بۆ ناو شار شانەی ڕێکخستنەکانیان ئاشکرا دەبێت کەوا ژمارەیەك لە لێپرسراوەکانیان لەلایەن رژێمی عیراقیەوە دەستگیر دەکرێن و ناوبراویش بەبڕیاری سەرکردایەتی (ی، ن، ك) لەشار دەردەچێت و ڕوو دەکاتە ناو شۆڕش و لەدەرەوەو لە (خڕی نێوزەنگ – ی پشدەر) شوێنی سەرکردایەتی یەکەمجاری (ی، ن، ك) تیپی شانۆیی (شۆڕش) دادەمەزرێنێ، کە بەکەم بەرهەمیان لە (زەڵێ) بۆ هێزی پێشمەرگەو خەڵکی گوندەکانی دەرووبەر بەناونیشانی (کێ کوشتی) پێشکەش دەکەن کەوا هەڤاڵ مام جەلال و ئەندامانی بەرزی سەرکردایەتی (یەکێتی نیشتیمانی ئامادەی بینینی شانۆکە بووبوون و دواتریش لەناملیکەی (ڕێبازی نوێ)ی زمانحاڵی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان) وتارێك سەبارەت بەکارو چالاکیەکانی تیپەکەیان دەنوسرێ و بلاو دەبێتەوە. دواتریش تیپەکەیان کۆمەڵێك کارو چالاکی تری شانۆیی ئەنجام دەدات و هەڵدەستێت بە ئەنجامدانی گەشتێکی هونەری گەڕۆك بۆ ناوچەکانی (باڵەکایەتی، وەرتێ، دێگەڵە، سەرکەپکان) و نمایشی شانۆیی بۆ خەڵك پێشکەش دەکەن، کە ئەوکات رێکخستنەکانی ناوەوەی (یەکێتی نیشتیمانی کوردستان) بەتامەزرۆوە دەچوون بۆ بینینی ئەم شانۆگەریانە. هەر لەو نێوەدا کامێرایەکی (سوپر ٨ ملم)ی سینەمایی دەست مامۆستا عەباس عبالرزاق دەکەوێ بەهەندێ فیلمی ٨ ملم یەوە کەپێشتر کامێراکە لەلایەن شەهید (دکتۆر خالید) بەکارهێنرابوو.

– هەروەکو بەڕێزیشیان ئاماژەی پێکردو وتی: لەگەشتێکماندا لەگەڵ شەهید (شەماڵ) ی (کۆیە) بەو کامێرایەوە رۆیشتینە ناوچەی (کۆیە) بەو مەبەستە تاوەکو کامێرا ببێتە زمانحاڵی شۆڕش. لەکاتی وتووێژەکەی ١٩٨٤ ی نێوان (ی، ن، ك) و حکومەتی بەعس مامۆستا عەباسی ڤیدیۆ داوا لەبەڕێز (مام جەلال) دەکات کە کامێرایەکی ڤیدیۆیی بۆ بکرێت، کە بەبڕیاری ئەو کامێرایەکی ڤیدیۆیی نوێی بۆ دابین دەکرێ، وەکو بەڕێزیشیان ئاماژەی پێکرد وتی: یەکەمین کاری ئەم کامێرایەش تۆمارکردنی (داستانەکەی دابان – هەلاج) بوو لەدوای سەرنەکەوتنی گفتوگۆیەکان، هەروەها بەڕێزیان وتی: ئیتر لەڕێگەی کاری وێنەگرتنی ڤیدیۆییەوە ئەرشیفی داستانەکانی پێشمەرگەو رووداوەکان و چاوپێکەتنەکانی شۆڕشەکەم ئەنجامداوە لەگەڵ کۆکۆدنەوەی گوڵە کێویەکان، لەنێو ئەم کارانەشمدا چاوپێکەوتنەکەی (حەمەسوری کلاوقوت)ە کە لە ١٩٨٥/٩/٢٢ لەماڵی حەمە سور و لە چونمان بۆ (گوندی کلاوقوت) لەگەڵ (تیپی ٢١ ی کەرکوك)دا ئەنجامم داوە. جیا لەهەموو ئەم کارانەش (مامۆستا عەباس عبالرزاق) وەکو شایەتحاڵێکی کیمیابارانی شاری (هەڵەبجە) لەلایەن رژێمەکەی (صدام حسێن) سکالای لەسەر تاوانبارانی رژێمەکە تۆمار کرد، ئەویش بەنیشاندانی بەڵگە وێنەییەکانی سات و دوای بۆردومانەکە کەخۆی وێنەی گرتبوون کە وەکو بەڕێزیشیان ئاماژەی پێدا بەڕادەیەك دیمەنەکانی فیلمەکەی کاریگەر بوون کە دادوەرەکە (محد عرێبی خەلیفە) بەبینینیان گریانی هات .

مامۆستا عەباس عبالرزاق لەساڵی ١٩٧٦ لەگەڵ خاتو (نەجات غولام) لەئێران ژیانی هاوسەری پێکهێناوەو خاوەنی دوو کوڕە بەناوەکانی (شێرکۆ – کەهونەرمەندێکی شێوەکارە) و (شارۆ – کەخوێندکاری بنەڕەتیە) و سێ کچ بەناوەکانی (سۆزان – مامۆستای ئامادەیی کۆمپیوتەر)، (خەبات – هونەرمەندی ناسراوی موزیك)، (شەنگە – هونەرمەندی شێوەکار) ە .

ماوەتەوە بڵێین کەئێستاکە مامۆستا عەباسی ڤیدیۆ لەگەڕەگی (عەقاری– سلێمانی) نیشتەجێیەو هیوای تەمەن درێژی و تەندروستی بەردەوامی بۆ دەخوازین .

**دەقـــی دیـــدارەکـــەی حـــەمـــەســـور**

پێشمەرگەکان لەدیوەخانەکەی حەمەسورن و حەمەسور دەڵێ: بەخێرهاتن .

**حسن جوبلاغی**/ ئەوە کامێرای تەلەفزیۆنە ؟

**حەمەسور** / پێشمەرگەن ئێوە ؟

**شەوکەتی حاجی موشیر** / بەڵێ پیشمەرگەی یەکێتی نیشتیمانی .

**حەمەسور** / گوتت چی ؟

**پێشمەرگەیەك** / پێشمەرگەی یەکێتی .

**حەمەسور** / یەکێتی ؟

**پێشمەرگەیەك** / یەکێتی بەڵێ نیشتیمانی کوردستان .

**شەوکەتی حاجی موشیر** / چۆنی کاکە حەمە ؟

**حەمەسور** / خوا عافوت کا یاخوا .

**شەوکەتی حاجی موشیر**/ خۆزگە پیربوون نەبوایە .

**حەمەسور** / یاخوا بەخێربێن .

**شەوکەتی حاجی موشیر** / خۆشبی یاخوا سەلامەت بی .

**شەوکەتی حاجی موشیر**/ کاکە حەمە .

**حەمەسور** / بەڵێ .

**شەوکەتی حاجی موشیر**/ چی زەمانی قەدیمت بەبیردێ ؟

**حەمەسور** / هەمووشتێکم بەبیردێ .

**شەوکەتی حاجی موشیر**/ ئەو دەورانەی کەبەسەریا هاتووە تائێستا چەند کەلیمەیەکمان عەرزکەی .

**حەمەسور** / وەلا بەبیرم دێ نازانم، لەفکرم نەماوە .

**شەوکەتی حاجی موشیر** / عومرت چەند ساڵ دەبێ ؟ تەمەنت چەند ساڵ دەبێ ؟

**پێشمەرگەیەك** / سەد ساڵ ئەبێ .

**حەمەسور**/ بەپێکەنینەوە چل ساڵ دەبم .

کۆمەڵێك پێشمەرگە بەپێکەنینەوە کوڕە کوڕە .

**حسن جوبلاغی** / سەد ساڵ زیاترە، مەخسەدی سەدو چلە .

**پرسیار** / سەدو چل ؟

**حسن جوبلاغی** / ئەها ئەها دەزانی چۆنە ؟ چی بەفکردێ، زەمانی سوڵتان مەجیدی بەفکر دێ .

**پرسیار** / یاعنی سەدو چل ساڵ دەبێ ؟

**پێشمەرگەیەك** / ئا .

**حسن جوبلاّغی** / سەدو بیست سالّ، هەر ئەوەندە دەبێت .

**پرسیار** / سەدو چل دەبێت ؟

**حەمەسور** / سەدوچل ؟

**پرسیار** / بەڵێ .

**حەمەسور** / کوڕە ئەریّ ئیشالاّ .

لێرەدا هەردوولا پێدەکەنن، سەدو چل لەکویّ ئاوەخواتەوە .

**پرسیار** / زەمانی عوسمانلیت لەبیردیّ ؟ زەمانی عوسمانلی ؟

**حەمەسور**/ ئا .پرسیار / لەزەمانی چ سولّتانێکا بوو ؟

**حەمەسور** / نازانم بەخوا لەبیرم نەماوە .

**پرسیار** / نازانی ؟ ـــ

**حەمەسور** / تۆ ........... کەم بۆبانگکە .

**پرسیار**/ بۆ بەقوربان بۆ قەیناکە دانیشە .

**حەمەسور**/ نانیان بۆ بێنن .

**حسن جوبلاّغی** / نانیان خواردووە، وەختی نان خواردنیّ نیە، ئێواریّ بۆیان دێنم .

**حەمەسور** / باشە

**حسن جوبلاّغی** / ئا ئا .

**پرسیار** / کاکە حەمە ؟

**حەمەسور**/ بەڵێ .

**پرسیار** / وەزعی ژیان لەوسەردەمەی قەدیماو ئێستا چۆنە ؟

**حسن جوبلاّغی** / ژیانی ئەوکاتەو ژیانی ئێستا ؟

**حەمەسور** / نازانم کوڕە .

**پرسیار** / نازانی ؟

**حەمەسور** / نا .

**حسن جوبلاّغی** / توجاریّ وەختی نانە، ئەمجا نانیان بۆدێنین ئا .

**حەمەسور** / باشە .

**پرسیار** / کاکە حەمە ؟

**حەمەسور**/ بەڵێ .

**پرسیار** / لەپەیڕەوی هەقە چیە ؟ یەك تۆزیّ شتمان بۆ باس بکەی خراپ نیە خۆ ؟

**حسن جوبلاّغی** / نا .

**حەمەسور** / **هەق** .. پێدەکەنێ .

**پرسیار** / بەڵێ .

**حەمەسور** / کوڕە هەزار شت هەیە چوزانم چی .

**پرسیار**/ یەك دوو سێ لەو هەزارمانە .

**حسن جوبلاغی**/ هەقیقەتەکەیان بۆ بخوێنەوە .

**حەمەسور**/ ئا .

**حسن جوبلاغی**/ هەقیقەت هەقیقیەتەکەیان بۆ بخوێنەوە کاکە .

## پەخشانە شیعری حـــەقـیـقـــەتــنـــامــــە لەزمانی حەمەسورەوە.

## ئایدۆلۆژیاو مانیفێستی هەقەکان

ئەم پەخشانە شیعرە کە بەناونیشانی (هەقیقەتنامە) یان (حەقیقەتنامە)یە دەکرێ وەك ئایدۆلۆژیاو مانیفێستی هەقە دابنرێ، ئێمە لەزمانی حەمەسور نوسیومانەتەوە لەکاسێتە ڤیدیۆییەکەی ١٩٨٥/٩/٢٢ کەوا مامۆستا عەباس عبدالرزاق ئەم دیدارەی لەسەردەمی پێشمەرگایەتیدا لەگەڵیدا ئەنجامداوە، سوپاس بۆ (مامۆستا عەباس عبدالرزاق اکبر) کەڕێگەی پێداین ئەم دیدارە بلاو بکەینەوە، هەروەها سوپاس بۆ (کاك ئازاد ئەبوبکر کلاوقوتی) کە زۆرێك لەوشەکانی بۆ ڕاست کردینەوە .

**سەرنج**/ زۆر سۆراغی ئەوەمان کرد کەدانەری ئەم پەخشانە شیعرە واتە ئەم هەقیقەت نامەیە کێیە؟ بەلام بەتەواوی بۆمان ڕوون نەبۆوە، حەمەسوریەکان و خزمەکانی حەمەسور دەڵێن: لەدانراوی حەمەسور خۆیەتی، هەندێکی تر دەڵێن: لەدانراوی (مەلا نامیق ناڕوجەیی)ە .

**حەقیقەتنامەکە:-**

بسم الله الرحمن الرحیم

بیخوێنین مەتڵەبی کاری (کەریم)

دائیرەی حەق شوناسی

هەروەکو ماسی

کەوتنە بەحری غەواسی

هەموو مەست و فەنا فیللا بوون

مەستی نەزەری خاتەمەل ئەولیا بوون

واسیتە حوکمی مەستی بوو

لەخەتی شەریعەت و تەریقەت تەوەللا بوون

هەموو ئەهلی زیکر بوون، خاریج بوون لەزیکر، بوون بەئەهلی زیکر

فکریان کردە عیلمی ڕەحمانی

وتیان ئەمە چی بوو خوا بەسەر ئێمەی هانی

با وشیار بین لەچی ؟ لەئیمتیحانی

لەئیمتیحانی بەحری مەعانی

نەوەك بكەوینە دەستورێكی شەیتانی

ئیشێكی عەجایب و نادر بوو

خودا بۆخۆی پێی قادر بوو

ئیرادەی لەسەر صادر بوو

ئارەزووی ئیجتیهادیان كرد

لەئارەزووی ئیجتیهاد فیرقە فیرقە وەستانەوە

فیرقەیەكیان لەبیر، چیان كرد بەتەكبیر ؟خنكان و بوون بەئەهلی موتەحەیر

هیچیان نەزانی هەروتیان (**وَاللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ**)

ئەوانیش لەدەستنەڕۆیی فەقیر

فیرقەیەك لەوان بوونە مونكیر

وتیان: بەڵێ لەواقیعدا (**وَاللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ**)

ئەمما ئینسان چەند شەراییتێكان بۆ خودا شوناسی

دەبێ بكاتە تەكبیرو زنجیر

ئەو لەمیسال شەریعەتی كەبیر

لەسەر ئەو شەراییتانە

(**وَأَن لَّيْسَ لِلْإِنسَانِ إِلَّا مَا سَعَىٰ**)

مەدەد یاشاهی قەدیر

عیلی حەقیقەتمان خوێند

چی دەبێتە قسەو كەلیمە

مەلیكی ئێمە كێیە؟ كەریمە

ئەمە قسێكی كوردیە

كورت و موختەسەرە

دەلیلی حەق شوناسیمان برادەرە

ئەمە قسەیەكی ئیسپات و بێ شكە

ڕەفیقی قیامەتمان خوشكە

شەیتانمان عەدووە

دینمان دینارە

بۆچی کەچونکی ئەمڕۆ ئاخیر زەمانە
مانای ئاخیر زەمان نەزمی شەیتانە
با تێبگات هەرکەسێ مەردی ڕەحمانە
بۆئێمە نەزەری (کەریم) سوپەرە
با لەسەر بەحسی هەق شوناسی
بیکەینە موجادەلەو موزاکەرە
ـــ بابزانین مانای شێتی چیە ؟
ئێمە شێتی تەریقەتین
مانای شێتی هەقیقەتە
مانای هەقیقەت خوێندنە
مانای خوێندن سەعی کردنە
مانای سەعی کردن عەقڵ و کەماڵە
مانای عەقڵ و کەماڵ تەرتیباتە
چونکی تەرتیبات بۆ هەق شوناسی ئیسپاتە
کەسێ لەسەر ئەم شەرایتانە ئیکمالە
هەر ئەو هەبووەو کەریمی مالە
ئەو کەسە بۆ کوللی کەسێ مەنبەعی سوئالە
ئەوکەسە موجتەهیدی بەینی حەرام و حەلالە
ئەوکەسە لەسەر نەفسی ئەمارە زاڵم و زەوالە
ئەوکەسە دەزانێ چی شەیتان و چی دەجالە
ئەوکەسە لەنەزەر دنیادا فەقیرو توفقالە
ئەوکەسە سەرچەشمەی مەعاریف و کەمالە
پەنام بەتۆ یاڕەببی
ئەی ئەوکەسەی کەحاڵزانی حاڵە
چونکی بونیەتی ئادەم و حەوا عمومی شەیتانە، دۆستی شەیتانە
تەوقی لەعنەت لەگەردنیانە
ئەوقسەیە (ماعدی) ی موئمینانە
تەوقی لەعنەت چیە ؟نەفسە، نەفیش چیە ؟ محەبەتی دنیایە
نەفس چیە ؟ چەپکە گوڵی دنیایە، تەکەبوری دنیایە
بە نەزەری ئەوکەسەی کەخاتەم و ئەولیایە

ئیجتیهادمان کرده دەرەجەی نیهایه

ڕووو تێکردنی خوامان دانا

بەپشت تێکردنی دنیایه

قەسەم بەقەسەمێکه والله و بیللایه

هەرکەس چاوی دنیای نەقوچێنێ

چاوی لای خوای هەڵنایه

ئەگەر دەشڵێی ئەم ماڵی دنیایه چیه ؟

هەزار تەئویلم لەوێدایه

ئەم عیلمه عیلمی حاڵه

عیلمی قال بەنەزەریەوە

قەتره بەدەریایه

کەسێك کەسه حەرفێکی بەسه

کەسێك ئەمەندەی بەس نەبێ

هەر تالیبی هەواو هەوەسه

ئەم عیلمه عیلمی قەسەسه

والسلام کەریم و هاوارە.

## دەقی دیدارەکەی حسن محمود جوبلاغی جێنشینەکەی حەمەسور

حسن محمود جوبلاغی: عەدالەت مەعنای وایه که گێکەوە بژی و گێکەوە نان بخۆی گێکەوە هەستی و دانیشی و ئیدارە بکەی.

حسن جوبلاغی کەدوای نەمانی حەمەسور شوێنی ئەوی گرتەوە لەساڵی ١٩٨٩ لە (تەکیە) بەلێدانی ئۆتۆمبێل کۆچی دوایی دەکات و لەگۆڕستانی (پیریادی) کۆمەڵگەی (شۆرشی چەمچەماڵ) بەخاك سپێردراوە، هەر لەسەرەتای جیابوونەوەکەی حەمەسور لەگەڵیدا بووە ئەمەی خوارەوەش ئەو دیدارەیە کە بەڕێز (مامۆستا عەباس عبدالرزاق) لە ١٩٨٥/٩/٢٢ لەگەڵیدا لە (کلاۆقوت) ئەنجامیداوە:

**سەرەتای دیدارەکە :**

حسن جوبلاغی لە(شەدەڵە) بووین وەختی خۆی هەمووومان مریدی ئەوی بووین لەگەڵ مامە ڕەزایان و هەموو یەك بووین .

**پرسیار:** شەوکەتی حاجی موشیر: بەڵێ .

**حسن جوبلاغی:** دوایی لەگەڵ مامەڕەزایان ئێمە لەسەر مەسەلەی خەلافەت کەشێخ فەرموبووی، شێخ وەسیەتی کردبوو کەس مەعجوز نیه بە خەلافەتی تەریقەتەوە، ئەوانیش دەیانگوت: دەبێ مامە ڕەزا خەلافەتی تەریقەت

بکات، ئێمەش لەسەر ئەوەی گوتمان: شێخ وای فەرمووە ناکرێ، لەسەرئەوەی لێك بووینەوە، ئێمەش بۆخۆمان کۆمەڵێك بووین هاتین لێرە دانیشتووین و ئەم خانووماڵەمان پێکەوە ناوەو کەسابەت دەکەین بۆخۆمان و بەیەکەوە هەستاوین و دانیشتووین و .

**پرسیار:** کەسابەتەکەتان چۆنە ؟

**حسن جوبلاغی:** کەسابەتەکەمان فەلاحەتمان کردووەو قەزوان دەکەین و چپ و چۆڵەمان هەروا هەندێك هەبووەو ئەوا ئەم کەسابەتە بووە .

**پرسیار:** هەرکەس بۆخۆی دەکات یان نا ؟

**حسن جوبلاغی**: نا، کەسابەتەکەمان کە دەیکەین بەیەکەوە لەو موڵکایەتی و لەهینەکەیدا هەموو موشتەریکین و هەرکەسەمان هۆدەیەکمان هەیە بۆخۆمان و ماڵی خۆمان .

**پرسیار:** ئێوە بۆچی چای و جگەرەتان تەرك کردووە ؟

**حسن جوبلاغی:** لەبەرئەوەی وەختی خۆی چا، جگەرە کە تەرکمان کرد، لێرەدا حەمەسور دەڵێ (حسن نانیان بۆبێنن).

**حسن جوبلاغی:** بەقوربان نانیان بۆ دێنین جارێ وەختی نان خواردنێ نەهاتووە وا بۆمان دروست کردوون .

**حەمەسور**: باشە

**حسن جوبلاغی:** وەختی خۆی کە چامان تەرك کردووە، زوو زەمانی خۆی جگەرەمان کە تەرك کرد کەشێخ وەفاتی کرد جگەرەمان نەخوارد لەدوای وەفاتی شێخ .

**پرسیار:** شێخی گەورە ؟

**حسن جوبلاغی:** شێخی گەورە شێخ عبدالکریم .

**شەوکەتی حاجی موشیر**: بەڵێ

**حسن جوبلاغی:** لەدوا ئەویش هین بوون ئێمە مەسەلە جیایان کردینەوە لەدائیرەکەی ئێمە نەختێك بۆخۆمان کەم بووین و ئەو وەختەش کەسابەت و شتی وامان نەدەکرد، گوتمان: کوڕە وەلا با چاش تەرك کەین .

**شەوکەتی حاجی موشیر**: بەڵێ

**حسن جوبلاغی:** چاشمان تەرك کردووەو ئەوە چەند ساڵە .

**پرسیار:** بەبڕیاری شێخ تەرکتان کرد، یان هەرخۆتان تەرکتان کرد چا ؟

**حسن جوبلاغی:** بەخوا وەختی خۆی شێخ قسەیەکی فەرموو، شەکرو چا گران بوو بوو، شێخ مابوو گوتیان: وەلا گران بووەو نەیخۆین و پارە کەمبوو، شێخ فەرمووی: نا ئێمە هەتا دەبێتە ڕوبعێك دەیخۆینەوە لەوە بەولاوە نایخۆین، ئەو وەختە کە کەللەی بوو بەڕوبعێك لەسەر ئەم ئەمرە نەمان خوارد و تەرکمان کرد .

**پرسیار:** پرسیارێکی تر مام حسن ؟

**حسن جوبلاغی:** فەرموو .

**پرسیار:** ئێوە بۆچی مەنعی منداڵ و شتتان کردووە ؟

**حسن جوبلاغی:** مەنعی منداڵ و شتی وا ؟

**شەوکەتی حاجی موشیر:** بەڵێ.

**حسن جوبلاغی:** مەنعمان نەکردووە، مەنعی منداڵ و شتمان بۆ کردووە، ئێستا ئەوا منداڵمان گەورە دەبن پێمان ڕەزا نابن، دەچن بۆخۆیان لەم شارانەو لەم هینانە، ئێمە چونکە بەواستەی تەریقەتەوە پێکەوە دانیشتووین، منداڵیش تەریقەت نازانێ، کە گەورەبوون لێمان جیا دەبنەوەو دەڕۆن .

پرسیار: تۆ بۆخۆت کوڕت هەیە ؟

**وەڵام:** نەوەڵا نیمە .

**پرسیار:** کچیشت یە ؟

**وەڵام :** نەوەڵا کچیشم نیە .

**پرسیار:** ئایا ئێوە بۆچی نوێژو ڕۆژوو ناکەن ؟ دەڵێ: کوڕە هەیە دەیگرێ و هەیە نایگرێ، بۆ خۆ .....

**پرسیار:** بەقەناعەتەوە نایکەی ؟

**وەڵام:** بەڵێ

**پرسیار:** قەناعەتتان چۆنە بۆ نوێژو ڕۆژوو ؟

**وەڵام:** قەناعەتمان ئەوەیە دەڵێین نوێژوو ڕۆژوو نەیکەی و نەیگری خەراپە .

**پرسیار:** فەرز نیە لای ئێوە ؟

**وەڵام:** ئەرێوەڵا ئەوی بڵێ کە فەرز نیە پێمان کافرە .

لێرەشدا حەمەسور دەڵێ: نانیان بۆ بێنن .

**حسن جوبلاغی:** نانیان بۆ دێننین، ئێستا دروست نەکراوە نانەکە، وەختی نان خواردنێ نەهاتووە .

**حەمەسور:** ئێ ئێ .

**حسن جوبلاغی:** ئەوا ئەسڵی خۆی پیاوێك هەبوو لەناومان برادەری خۆمان بوو، خاڵۆی ئەو (حاکم موعتەصەی)ی بوو، موعتەصەمی کەوا ئێستا حاکمە، عەزووە لەهینێ لەمەجلیسێ عورفیە، کوڕە هینە، هینە لەحکومەتدا .

**شەوکەتی حاجی موشیر:** بەڵێ .

**حسن جوبلاغی:** خاڵۆی ئەوەی بوو، نەختێ موڵکی ئاسیاوێکی هەبوو، موڵکەکەمان لێ کڕیبو هەتا بەشی خۆشیان ئەویش بەشی تێدابوو لێمان کڕی، دوایی کەخاڵۆکەی مرد تەماشای کرد ئاسیاوەکە (وەستا حمەد) لەسەر (کاکەحەمەی) تاپۆ کردووە . لەسەرئەوەی تاپۆکەی لێ ستاندینەوە بە سێ سەد دینار بوو چەند بوو، ئەوجا دوایی هەستا موئامەرێکی بۆ ڕێکخستین، کاکە حەمە گیرا، کە کاکەحەمە گیرا معامەرەکەی ئەوەبوو لەکن عالەم دەیوت: ئەم پیاوە ئیدیعا پێغەمبەرایەتی دەکات، ئەمە واو جا ئەمەی بڵاو بۆتەوە، چەند شاهیدی پەیدا کردبوو، چۆنی متەههەم ببێ ئەو قسانەی دەکرد، جا ئەوە ئەوەیە بڵاو بۆتەوە .

**حەمەسور:** نانیان بۆبێنن با بخۆن .

**حسن جوبلاًغی:** بەقوربان ئاخر نان، وانانمان بۆ کردوون با مەغریب ببیٚ ئبنجا نانیان بۆ دەبەین .

**حەمە سور:** باشە .

**حسن جوبلاًغی:** ئا، موعتەصەم بلاًوی کردەوە بۆخاتری ئەوەی لەحکومەت موتەهەم ببیٚ، ئاخر حوکمەتی ئەو وەختەی دەیانگوت: ئەمە ئەوی کەئیدیعای پێغەمبەرایەتی کا ئێستێش موتەهەم نابیٚ ؟ ئەمە هەموو ئەو بلاًوی کردەوە کە ئەم پیاوە ئیدیعای وایەو وایە، بازە قسێکی هەیە ئیتر ئاوا .

**حەمەسور:** نانیان بۆ بێنن .

**حسن جوبلاًغی:** با مەغریب ببیٚ لەدیوەخانەکەی ئینجا نانیان بۆ دەبەین .

**شەوکەتی حاجی موشیر:** ئێستا زووە قوربان زووە .

**حەمەسور:** زووە ؟

**شەوکەتی حاجی موشیر:** بەڵیٚ عەصرە هێشتا .

**حەمەسور:** باشە .

**شەوکەتی حاجی موشیر:** ماڵت نەشێویٚ هیچی زەمانی قەدیمت لەبیر نیە بۆمان باس بکەی ؟

**حەمەسور:** بەخوا کەم .

**شەوکەتی حاجی موشیر:**ئیٚ باشە دوو سیٚ شتمان بۆ باس بکە، پێمان خۆشە وەکو تاریخ لەلامان دەمێنیٚ ئەوە.

**حەمەسور:** هیچی وام لەبیر نیە .

**حسن جوبلاًغی:** لەفکری نەماوە بەقوربان، چاوت لیٚ نیە هەندیٚ حاڵەت هەیە کەڵکی ئەوەی نەماوە ئی قسەی.

**حەمەسور:** حسن نانتان بۆ دروست کردوون .

**حسن جوبلاًغی:** بەڵیٚ بۆمان دروست کردوون خەمت نەبیٚ، هەرئێستا نانیان دەدەینیٚ تۆ خەمی ئەوەت نەبیٚ .

**حەمەسور:** دەباشە .

**حسن جوبلاًغی:** صۆفیەتی و تەریقەتەوە دانیشتووین بەیەکەوە .

**شەوکەتەی حاجی موشیر:** خاڵە حسن .

**حسن جوبلاًغی:** بەڵیٚ.

**شەکەتی حاجی موشیر:** بەرهەمی ئەو کەسابەتەی کە بەرهەمی دێنن بەرهەمەکەی چی لێدەکەن .

**حسن جوبلاًغی:** بەرهەمەکەی ؟

**شەوکەتی حاجی موشیر:** بەڵیٚ .

**حسن جوبلاًغی:** چیٚ لێدەکەین، هەرکەس ماڵ و منداڵی خۆی .

**حەمەسور:** بەرهەمی چی ؟

**شەوکەتی حاجی موشیر:** تەوزیعی دەکەن بەسەر ماڵ و منداڵەکەیا ؟

**حسن جوبلاًغی:** بەڵیٚ .

**شەوکەتی حاجی موشیر:** یان هەرکەسە بەرهەمەکە بۆخۆیەتی، بەرهەمی کەسابەتەکە چی لێدەکەن ؟

**حسن جوبلاغی:** ئێستێ ئێمە تۆ گوێ بگرە .

**شەوکەتی حاجی موشیر:** بەڵێ بەڵێ کەسابەتەکە چی لێ ئەکەن ؟

**حەمەسور:** دەیخۆین .

**پرسیار:** چۆنی دەخۆن ؟ یانی هەرکەسە بۆخۆی ؟ یان تەوزیعی دەکەن بەسەر فەقیرو هەژارا ؟

**حەمەسور:**دەیخۆین،ماڵێك کەخێزاندار بێ هەموو پێکەوە نان دەکەن، پێکەوە نان دەخۆن، ئێمەش وا، ئەی ئەوا.

**حسن جوبلاغی:** ئەگەر خێرو ئیحسانیشی لەسەر بکەین وا بەقەراری هەموانمان خێرێك ئیحسانێك دەکەین و لەوە بەولاوە ئەم کەسابەتەی دەیکەین بۆخۆمان هەموو لایەك پێی دەژین و کەسابەتەکەمان شەریکە، نیهایەت چیە ؟ هەرکەسەمان لەهۆدەو ماڵی خۆماندا .

**حەمەسور:** ئەوە لە ئەقڵی بەشەرا نیە .

**حسن جوبلاغی:** ئەوە ئێمە بڕیارمان هەر لەسەر مەسەلەی تەریقەت و برایەتیە، چونکی تەریقەت و برایەتی ئێمە ئەمە بەبرایەتی دەزانین و بەعەدالەتی دەزانین ئەم هینەی خۆمان ئەم برایەتیە، جا عەدالەت مەعنای وایە کەپێکەوە بژی و پێکەوە نان بخۆی و پێکەوە هەستی و دانیشی و ئیدارە بکەی . ئێستێ کەسێك جنێوێکی بەکەسێك نەداوە، کەسێك لەکەسێك تورە نەبووە .

**حەمەسور:** حسن ؟

**حسن جوبلاغی:** بەڵێ .

**حەمەسور:** نانیان بۆ نەهێنین بخۆین ؟

**حسن جوبلاغی:** سی ساڵ چل ساڵیش دەبێ، نانیان بۆ دێنین بەقوربان بۆیان کراوە .

**شەوکەتی حاجی موشیر:** تۆ خەڵکی کوێی ؟

**حسن جوبلاغی:** من خەڵکی جوبلاغم .

**پرسیار:** جوبلاغی ئەولا ؟

**حسن جوبلاغی:** کن دوکان (شەریکەی دوکان)

**پرسیار:** کاکە حەمەش چەند ساڵ لەمەوپێش لەکوێ لەدایك بووە لە ئەسلا ؟

**حسن جوبلاغی:** کاکە حەمە لەسورداش لەدایك بووە، ئەسڵێ باوکی خەڵکی (شەشۆ)یە ناحیەی (ماوەت) .

**پرسیار:** شەشۆ ؟

**حسن جوبلاغی:** بەڵێ .

**پرسیار:** ئەم صۆفی ترە ناوی چیە؟

**حسن جوبلاغی:** ئەمە حەمەی ناوە.

**پرسیار:** ئەوە خەڵکی کوێیە ؟

**حسن جوبلاغی:** ئەو خەڵکی هەنجیرێ دەشتی مەرگێ .

**حەمەسور:** کێ ؟

**حسن جوبلاْغی:** حەمە .

**پرسیار:** کە ئەفەرمووی لە ئەقڵی بەشەرا نیە، یاعنی مەسەلەی ئەو ئیشتیراکیەتی ئیشکردنی ئێوە، یەك بۆچی لەئەقڵی بەشەرا نیە ؟ .

**حومەسور:** لەئەقڵی بەشەرایە دەبێ تەبلیغی بکەی .

**پرسیار:** تەبلیغی بکەی ؟

**حەمەسور:** ئا، بلێی ئەواو ئەواو ئەوا .

**پرسیار:** تەبلیغی بکەی کەبەوشێوەیە کاربکات؟

**حەمەسور:** پێدەکەنێ .

**پرسیار:** تەبلیغی بکەی کە بەوشێوەی ئسولەی ئێوە کاربکات ؟

**حەمەسور:** بەڵێ بەڵێ .

**پرسیار:** دەباشە بۆلە ئەقڵی بەشەرا نیە ؟

**حەمەسور:** لەئەقڵی بەشەرایە، کەم .

**پرسیار:** کەم ؟

**حەمەسور:** کەم.

**حسن جوبلاْغی:** مەخسودی ئەوەیە یانی شتێکە ئیرادەی خوایە، جا ئیرادەی خوا کەهات مەسەلە لەپێشەوە ئیرادەکە سادر دەبێ ئینجا بەشەرەکە.

## چاوپێکەوتن لەگەڵ ( حسن کەریم صۆفی شەریف ) زاواکەی حەمەسور

(حسن کەریم صۆفی شەریف) لەدایکبووی ساڵی ١٩٣١ گوندی (گوڵیجە) ی سەر بەناحیەی (سورداش) کەئێستاکە لەشاری (سلێمانی) نیشتەجێیە، لەساڵی ١٩٦٥ هاتووە بۆ سلێمانی و لەساڵی ١٩٦٧ لەگەڵ (فاتم حەمە سور) ژیانی هاوسەری پێکدەهێنێت کە دووەم ژنی بووە، بەرهەمی ئەم دوو ژن و مێردە سێ کوڕ بووە بەناوەکانی: (یاسین لەدایکبووی ١٩٦٩، ڕزگار لەدایکبووی ١٩٧٢، بەختیار لەدایکبووی١٩٧٥) . فاتمی هاوسەری لەساڵی ٢٠٠١ لەسلێمان کۆچی دوایی کردووە، حەمدیەی دایکی فاتیمەش لەساڵی ١٩٧٤ لەسلێمانی کۆچی دوایی کردووەو هەردوکیان لەگۆڕستانی (شێخ ئەحمەدی هیندی) بەخاك سپێردراون . سەبارەت بەچۆنیەتی خوازبێنی فاتم بەڕێزیان وتی: لەساڵی ١٩٦٧ لەگەڵ (حەمە کەریم عزیز یاخسەمەری) کە لە (سلێمانی) دادەنیشت چووم بۆ (کلاْوقوت) بۆلای (حەمە سور) بۆ خوازبێنی فاتمی کچی و بەبێ هیچ کۆت و بەندێك کچەکەی پێشکەش کردم کەدوازدە میسقاڵ زێڕیشم بۆی کرد .

**پرسیار :** حەمەسور داوای لێ نەدەکردی کەببیتە هەقە ؟

**وەلاْم :** نەخێر.

**پرسیار:** بۆچی حەمەسوریەکان منداڵ بوونیان لەخۆیان قەدەغە کردبوو ؟

**وەڵام:** حەمە سور دەیوت: گەر منداڵمان ببێ جیاوازی و کێشە دەکەوێتە نێوان خوشك برایەتیەکەمان و لێك دادەبڕێین.

**دیدارەکەی تاتە حەلاو لەدایکبووی ١٩٥٧ قەرانگوێ سەرپەرشتیاری پاشماوەی حەمەسوریەکان.**

– دوای خۆتان کێ سەرپەرشتی و خاوەنداری زەوی و زارەکانی (کلاّو قوت) دەکات، یان کێ دوای خۆتان شوێنی ئێوە دەگرێتەوە؟

**وەڵام/** بەهۆی ئەوە کە منداڵمان نەبووە و مێردەکانیشمان لە ژیاندا نەماون لە ئێستاوە بڕیارمانداوە زەوی و زارەکانی (کلاّو قوت) بدەینەوە بەخاوەنی یەکەمجاریان کە پێشتر لەوان کڕدرابوو.

٢– ئایا ئێوە بۆ ڕێگە گرتن لە منداڵبوون هیچ دەرمانێکتان بە کاردەهێنا ؟

**وەڵام/** نەخێر .

٣– ئەی ئێوە بۆ منداڵتان نەبووە ؟

**وەڵام** / لەبەرئەوەی مێردەکەم (عەبدوڵلاّ قوتانی) پێش ئەوەی ببمە هاوسەری مار پێوەی دابوو، کە کاری کردبوو لەسەر منداڵ نەبوونی، هاوسەرەکەی پێش منیشی کە ئامۆزای خۆیشی بوو، چونکە منداڵی لێ نەبوو، دایکەکەی دەیباتەوە و دواتر شو بە یەکێکی تر دەکاتەوە مێردەکەشم بە بەلاش لێی جیا دەبێتەوە .

**پرسیار/** ئایا پیاوەکانتان لەگەڵتان خراپ بوون؟

**وەڵام** / نەخێر بە هیچ جۆرێك .

**پرسیار/** ئایا داوای زێرتان لێدەکردن ؟

**وەڵام** / نەخێر جیا لە ئەڵقەیەك و گوارەیەك شتی ترمان داوا نەدەکرد، چونکە بەحەراممان دەزانی .

**پرسیار/** ئایا هیچ جار پیاوەکان خۆ بەخۆ لەسەر شتێك لەگەڵ یەك تورە دەبوون و کێشەیان دەکەوتە ناو ؟

**وەڵام** / نەخێر.

**پرسیار/** ئایا ساڵانە لە کلاّو قوت زەکاتی شەرعیتان لە داهاتەکانتان دەدا ؟

**وەڵام** / بەڵێ هەموو ساڵێ لەلای (مەلا عوبێدی کلاّو قوت) زەکاتمان دەردەکرد .

**پرسیار/** ئایا لە خانوەکەی کلاّو قوتتان، کە هەمووتان بەیەکەوە دەژیان ئاو دەست و حەمامتان هەبوو ؟

**وەڵام/** بەڵێ، سێ ئاودەست و دوو حەماممان هەبوو. کە یەکێ لە حەمامەکان بۆ خۆمان بوو، یەکێکیشیان بۆ میوان و ئاودەستی ژن و پیاوەکانی خۆشمان جیا بوو.

**پرسیار/** ئەو شەوەی کە گوندی (کلاّو قوت) تان لە شەوی (١٩–١٩٨٨/٤/٢٠) لەترسی شالاّوی (ئەنفالی سێ) چۆڵکرد و خۆتان گەیاندە ناو (چەمچەماڵ)، لەماڵ و دارایی چیتان لە (کلاّوقوت) لێ بە جێ ما کە لەلایەن سوپاو جاشی رژێمەکەی (صدام حسێن) بە تالاّنی بران؟

**وەڵام** / پەنجا سەر مانگا، ٨٠ کورە مێشە هەنگوین، یەك تراکتۆر، یەك پیکاب، سێ مەکینەی ئاو .

**پرسیار/** کەپیاوو ژنەکانی حەمەسوری ژیانی هاوسەریان پێکدێنا لەلای کێ مارە دەکران ؟

**وەڵام** / لەلای مەلا عوبێدی کلاّوقوت یان مەلا محمد .

**پرسیار** / ئایا بۆ حەقە مارەیی ژنەکان زێڕی زۆرتان داوا دەکرد ؟

**وەڵام** / حەقەمارەیی لەسەر زێڕ نەبوو تەنها لەسەر مانگاو مەڕ بوو.

## چاو پێکەوتن لەگەڵ ئـەبـوبـەکـر کـلاّوقـوتـی.

**سەرنج: ئێمە لەژمارە (٥٠)ی (گۆڤاری شمشارە) لەمانگی ٩ی ٢٠٠٩ ئەم دیدارەمان بڵاوکردبۆوە کە ئەوکات (ئەبوبەکر کـڵاو قـوت)ی لەژیانـدا مـابوو بـەڵام ئێسـتاکە کـە سـاڵی ٢٠١٨ لەژیانـدا نـەماوە.**

بەڕێز (مام ئەبوبەکر کلاّوقوتی) لەدایکبووی ساڵی ١٩٢٨ کەئێستاکەش لەژیاندایەو لەچەمچەماڵ نیشتەجێیە تاکو ئێستاکەش سەرقاڵی فرۆشتنی تەسبیحە لەسنوری سلێمانی و کەرکوك بەشێوەی دەستفرۆشی، هەرچەندەش تەندروستی ماوە ماوە خراپ دەبێ بەڵام ئەو ڕۆژەی کەسەردانیمان کرد هەرچۆنێك بێت توانی وەڵامی پرسیارەکانمان بداتەوە وێڕای ئەوەی لەسەر جێگا کەوتبوو، سەرەتاش پرسیاری شێوەی گیران و زیندانی کردنەی (حەمە سور)مان لێ پرسی و ئەویش بەمجۆرە بۆی باس کردین و وتی: یەکەمجار حەمەسور کەدێتە ناوچەی(شوان) لەگەڵ ئەوکەسانەی کە لەدەوری بوون لەگوندی (ئۆمەر بەگ) نیشتەجێ بوون لەوێ (وەستا ئەحمەد دوسن) هەبوو کەئەویش بوو بەمریدی حەمەسور کەلاوە ئاشێکی هەبوو، حەمەسور ئەم کەلاوە ئاشەو زەوی و زاری لێکرِی و دەستی کرد بەئاوەدان کردنەوەی ئاشەکەو ڕەزێکی هەنجیریشی لێ بەرهەمهێنا، دوای مردنی وەستا ئەحمد کەسێك بەناوی (حاکم معتصم) کەخوارزای (وەستا ئەحمەد) بوو داوای ئەو ئاش و زەوی و زارەی لە حەمەسور دەکردەوە، ئەوەبوو ڕۆژێك لەگەڵ مەئموری حکومەت هاتبووە لای کاکەحەمەو پێی گوتبوو: دەبێ بمان دەیتەوە، کاکە حەمەش دەڵێ: خەرجی ئاوەدان کردنەوەکەمان بۆ ڕەت بکەنەوە دەتان دەینەوە.

(حاکم معتصم)یش دەڵێ: ئێمە پارەی ئەو ساڵانەشمان دەوێ کە بەرهەمتان لێی دەست کەوتووە، دوای ئەوە (حاکم معتەصەم) لە کەرکوك داوا لەسەر کاکەحەمە تۆمار دەکات و تۆمەتی پڕوپاگەندەی پێغەمبەرایەتی و شتی دژی ئیسلامی دەداتە پاڵ، بڕیاری دەستگیر کردنی دەردەچێت و بەناوی دەعوەت بانگهێشتی کەرکوك دەکرێت کە لەگەڵ (حسن جوبلاّغی) دەچێت و لەوێ یەکسەر دەستگیری دەکەن، کەماوەی ٨ مانگ زیاتر لەبنکەی پۆلیسی (تەسفیرات)ی ئێستا زیندانی بوو، یەکێك لەپارێزەرەکانی کاکە حەمەش (شێخ سەمەد) ی کوڕەزای (شێخ حسێنی خانەقا) بوو، ڕۆژی ١٩٥٨/٧/١٣ دادگای کەرکوك کێشەکەی کاکە حەمە بەرز دەکاتەوە بۆ مەحکەمەی (عورفی = دادگای باڵای عیراقی) ئەوەبوو بەرەبەیانی ١٩٥٨/٧/١٤ شۆڕشی (١٤ی تەمووز) بەرپابوو کە (عبدالکریم قاسم) کۆتایی بە ڕژێمی پاشایەتی لەعێراق هێنا و هەر ئەو ڕۆژەش کاکە حەمە بۆ بەغدا بەرێ کرا، لەوێش پارێزەرێکی عەرەبی بۆ گیرا، ڕۆژی دادگاییەکەش حاکم (معتصم) خەڵکێکی زۆری لە (گوندەکانی شوان) بۆ شاهیدی دان دژی کاکە حەمە ئامادە کردبوو هەتا ئەوەی دادەوەرەکە کەناوی(مەهداوی) بوو بانگی یەکێك لەشاهیدەکان دەکات و پێی دەڵێت: تۆ حەمە سورت بینیوەو لێت بیستووە کە ئەو جۆرە قسانە دەکات؟ شاهیدەکەش دەڵێت: نەخێر نەمبینیوە بەڵام بیستوومە، دادوەرەکەش تورە دەبێ و

بەشاهیدەکان دەڵێ: ئەگەر ژمارەتان زۆر نەبایە ئێوەم لەجیاتی حەمەسور دەکردە ژوورەوەو حەمەسورم ئازاد دەکرد و هەمووتان درۆ دەکەن، ئیتر دوایی ئەوەبوو نزیکی مانگێك بڕیاری ئازادبوونی دەرچوو کە هەر شەوەکەی کە (من و شێخ ئەحمەدی کلاوقوت و سەید حامید دەلۆو کوێخا حەمەی مەلا عوبێد و سەید عومەر دەلۆو عەبدولرەحمان سەرمۆردی و حسن جوبلاغی و حەمە شوتەی هەنجیرەو عەبدولرەحمان قوتانی و فاتم خۆشاوی و خەجیج و تەلحەی هاوسەرەکانی حەمەسورو و لیمۆو مەلیح) کاکە حەمەمان لەگەڵ خۆماندا هێنایەوە بۆ کەرکوك و لەوێشەوە یەکسەر گەڕاینەوە کلاوقوت،بەهۆی ئەوەش کە کاکەحەمە لەسەردەمی هاتنە سەرکاری (عبدالکریم قاسم)دا ئازادبوو (فاتم خۆشاوی) یەکێ لەمریدەکانمان تامردیش وێنەیەکی (عبدالکریم قاسم)ی کردبوو بەمەدالیاو دەیگوت: تا دەمرم دەبێ بەملمەوە بێ.

**پرسیار** / ئەوانەی کە لەکلاوقوت لەگەڵ کاکەحەمە بەیەکەوە دەژیان کێی و کێ بوون ؟

**وەڵام** / بریتی بوون لە کاکەحەمەو سێ هاوسەرەکانی (خەجیج و تەلحەو بەهێ )، حسن جوبلاغی و دوو هاوسەرەکانی (ئامان مام برایم و سەفور خدرانی)، عبدالله خەلیفە قوتانی (حەلاو حسن مارف قەرانگوێی) هاوسەری، سابیر حاجی بەیخانی و قەدری هاوسەری، حسن بەقاڵ و بەلکیسی خێزانی – حەسەن بەقاڵیش بەناوچەکاندا دەگەڕاو دەرمانی کێچ و ئەسپێی دەفرۆشت کەلەسنوری گوندی (قەرەچەتان) چەتە بۆ پارە دەیکوژن، حەمەشوتەی هەنجیرەو هاوسەرەکەی مریەم خەلیفە قوتانی، (محمود تۆربەیی) کەلەمەرەزەدا مار پێوەیداو مرد – ژنی نەبوو، ڕەسوڵ حاجی خدر کەلکەسماقی کە لەکلاوقوت مرد، مستەفا بۆڵقامیش – ژنی نەبوو، سمایل عەتا – ژنی نەبوو، خدرە کوێر دزەیی – ژنی نەبوو، حەمە ڕەشید ئەحمەد قوتانی ژنی نەبوو، مام سەعید – ژنی نەبوو – کوا کەوچکی داری لەداری (کەوت) دروست دەرکردن و دەیفرۆشتن – شێعریشی دەخوێندنەوە، هەمین کانی تووبی کەبێوەژن بوو بەسالاچوش بوو، فاتم خۆشاوی بێوەژن بوو، ئامین شەریف قەرە عەربەت بێوەژن و بەسالاچوو بوو، ئەحمەد فەقێ سمایل کەوەڵەو هاوسەرەکەی سەبری حسن بەقاڵ، عبدالکریم ئۆمەر گومبەتی – ژنی نەبوو گەنجیش بوو .

**پرسیار** / دەڵێن ئەم عبدالکریمە لەکلاوقوت کوژراوە ؟

**وەڵام** / عبدالکریم گەنج بوو حەزی بە ڕاوکردن دەهات هەرچەندە کاکە حەمە لێشی قەدەغە کردبوو. ڕۆژێکیان بەدزی کاکەحەمە دەچێ بۆ ڕاو، لەدەشت کەسێکی خەڵکی (کلاوقوت) کەخەریکی جوت کردن دەبێ و تفەنگیشی پێ بووە بۆ خاتری تفەنگەکەی گوللەیەك لەدواوە لە عبدالکریم دەدات و دەیکوژێت، شوانێکی نزیك گوێی لەتەقەکە دەبێ و بەبکوژەکە دەڵێ ئەو تەقەیە چی بوو ؟ ئیتر بکوژەکەش جوتەکەی بەرهەڵدا دەکات و دەچێتەوە ناو دێیەکە، پاشان پۆلیس ئەو کەسە دەستگیر دەکەن و سێ مانگیش زیندانی دەکرێ بەڵام دواتر لەبەرئەوەی کاکەحەمە دەیگوت ئەگەر یەکێك بکوژرێ کێشەکە بەوە چارەسەر نابێ کەبکوژەکە بکوژرێتەوەو پاشان درێژە بدرێ بەکوشتنی تر، هەربۆیە کاکە حەمە بڕیاری لێ خۆشبوونی بکوژەکەی دا و بکوژەکەش ساڵی ٢٠٠٧ کۆچی دوایی کرد .

**پرسیار**/ حەمەسوریەکانی تر کێ و کێ بوون کە لەدەرەوەی پێکەوە ژیانەکەی حەمە سورو کۆمەڵەکەی لە

کلاوقوت دەژیان ؟

**وەلام** / بریتی بوون لە خۆم ئەبوبەکر کلاوقوتی، شێخ صدیق کەرکوکی، کوێخا حەمەی مەلا عوبێد، سەید حامیدی دەلۆ، شێخ ئەحمەدی کلاوقوت، حاجی سەلیم قەرانگوێ، حەمە قالە قەرانگوێ ، حسن مارف قەرانگوێ، حاجی یاسین حاجی ڕەسولێ قەرانگوێ، حاجی ڕەزای حاجی ڕەسولێ، حەمەی مامە ئەحە، محمود کانی سوری، مەلا ئەحمەدی نەبیاوا، کوێخا ڕەسوڵی مالومە.

**پرسیار** / پێش شالاوی ئەنفالەکە بۆ (گوندی کلاوقوت) ئەوەتان دەزانی کە ڕژێمەکەی (صدام حسێن) ئەگەر دەستگیرتان بکات ئەنفالتان دەکات ؟ .

**وەلام** / دیارە پێش شالاوی ئەنفالەکە جاشەکان دەنگۆی ئەوەیان بلاو دەکردەوە بەلام ڕاستی خەڵکەکە لەو بڕوایەدا نەبوو کەشالاوەکە تەڕو وشك پێکەوە بسوتێنێ بەڵکو لەو بڕوایەدا بوون وەکو چەندان جاری تر حکومەت هێرشێك دەکات و ڕۆژێك دوو ڕۆژ شەڕ دەبێ و کۆتایی پێدێت .

## چـارەنـوسـی زەوی و زاری حـەمـەسـوریـەکـان و باڵەکەی حەمەسورلەکلاوقوت.

دیارە (حەمەسور) و کۆمەڵەکەی کە لە گوندی (کلاوقوت) زۆربەی ژیانیان بەسەر بردووە زەوی و زارێکی زۆریان کڕیوە لەزەوی بەراوو پشتاو و باخ و باخاتی زۆریشیان لێ بەرهەمهێناوە، لە دوای ئەنفالی سێ کەگوندەکە چۆلکراوە تاکو ئێستاکەش باخ و باخاتەکانیان وێران بوون، ئێستا لەکۆمەڵەکەی (حەمەسور) تەنها پیاوێك بەناوی (ئەبوبکر کلاوقوت)ی و سێ لەژنەکانیان بەناوەکانی (حەلاوو ئامان و حەلیم) لەژیاندا ماون، کەوا ئەبوبکر کلاوقوتی لەسەردەمی (حەمەسور)یشدا لەدەرەوەی پێکەوە ژیانەکەیاندا ژیاوەو کوڕو کچیشی هەیەو ئێستا لە (چەمچەماڵ) لەگەڵ هاوسەرەکەی و کوڕێکیدا دەژیت، سێ ژنەکانیش کە ئاماژەمان پێکردوون هیچ منداڵێکیان نەبووەو ئێستاکە لەماڵێکدا بەیەکەوە دەژین لەناو کۆمەڵگەی (شۆڕش) گەڕەکی (پیریادیەکان) کەوا (تاتەحەلاو)یان بەهۆی ئەوەی کە تەمەنی لە دوو ژنەکەی تر کەمترە سەرپەرشتی ماڵەکە دەکات و تەبێژیانە .

وەکو کە لەدیدارەکەشمان لەگەڵیدا ئاماژەی پێکردووە سەبارەت بەچارەنوسی زەوی و زارەکانیان دەڵێ: لەئێستاوە بڕیارمانداوە دوای نەمانی خۆمان بگێڕدرێنەوە بۆخاوەنەکانی یەکەمجاریان کە لەسەردەمی (کاکە حەمەسور)دا لێیان کڕدرابوو .

**هەروەها** (ئەبوبکر کلاوقوت)یش لەوبارەوە وتی: سەردەمی خۆیشی کە (کاکە حەمەسور) زەوی و زاری دەکڕین سەنەدو نوسراوی نەدەکردو دەیوت: پێویست ناکات تائێمە بمێنین دەیان کەین و دەیان خۆین .

**چارەنووسی باڵی حەمە سووری:**

ئێستاکە کەساڵی ٢٠١٨یە تەنیا (تاتە حەلاو حەسەن مارف قەرانگوێیی) لە باڵی حەمەسووری لەژیانداماوە.

## ١- حــــەمـــاغـــایی و حـــــەمـــــاغــــایـــــیـــەکــــــان

١- حـەمـاغـای پـشـتـدەرو حـەمـاغـاییەکـان.

٢- نەریتی پەیڕەوەکانی حەماغا.

٣- بەشێك لەمێژووی هەنارۆك زێدی حەما غا .

٤- ڕەچەڵەکی حەماغا.

٥- حەماغا چۆن بووە موریدی شێخ عەبدولکەریمی شەدەڵە؟

٦- وەسێتەکەی شێخ عدولکەریم بۆ حەماغا .

٧- لەدوای کۆچی دوایی شێخ عەبدولکەریم حەماغا بانگەشەی جێنشینی بۆخۆی دەکات.

٨- کەسێتی حەماغا.

٩- بۆچی حەماغا پێی گوتراوە حەمە جنددار؟.

١٠- ڕای حەماغا سەبارەت بەنوێژ.

١١- حەماغا نۆ ژنی هێناوە کە دوانیان لەیەك ڕۆژدا بۆی گوازراو نەتەوە.

١٢- دیاریەکانی موریدەکانی کانی توو بۆ حەماغا

١٣- پێشبینیەکی حەماغا وەکخۆی دەرنەچوو.

١٤- نیشانە نەفس شکاندنەکانی گووڵاویاغا.

١٥- چارەنووسی باڵی حەماغا

## حەماغایی و حەماغاییەکان

دوای ئەوەی (شێخ عبدالکریمی شەدەڵە) دامەزرێنەری بزووتنەوەی هەقە کۆچی دوایی دەکات، هەقەکان بەسەر پێنج باڵدا دابەش دەبن بەم جۆرە، وە کو کە **لەپەڕتوکی (ئاوڕدانەوەیك لەبزووتنەوەی هەقە – لاپەڕە(٣٠) مستەفا عەسکەری)دا هاتووە:-**

بەشێك بەناوی (حەماغایی) کە (حەمە ئاغای پشدەر) سەرکردەیان بوو، ئەوانە زۆرتر نیشتەجێی گوندی (کانی توو) بوون، بەڵام پاش ماوەیەکی کورت (حەماغا) وازی هێناو چوو بۆ سەردانی گۆڕی (شێخ عبدالکریم لە شەدەڵەو دوای گەڕانەوەی کۆچی دوایی کردو کۆمەڵەکەی تێکچوو .

بەداخەوە تاکو ئێستا جیا لەو ئاماژە پێکردنە کورتەی بەڕێز (مستەفا عەسکەری) هیچ باس و خواس و بەدواداچونێك سەبارەت بە تەوژمی بزووتنەوەی هەقە لەناوچەی پشتدەرو هەقەکانی باڵی حەماغای پشتدەر نەنوسراوەو نەکرابوو بۆیە ئێمە لەژمارە(٥٠ی گۆڤاری شمشارە ساڵی ٢٠٠٩) هەستاین بە بەدواداچوونی ئەم بابەتەو ئەمەی خوارەوەش ئەنجامی بەدواداچونەکەمانە:

### نەریتی پەیڕەوەکانی حەماغا:

– پەیڕەوەکانی حەماغایی بە حەماغایان وتوە (مەهدی)

– گوتوویانە: نوێژو ڕۆژوون لەسەر نین و وتویانە: کەسێك نوێژ و ڕۆژوو دەکات کەقەناعەتی تەواو نیە ئەگەر کەسێك قەناعەتی تەواو بوو پێویست ناکات نوێژو رۆژوو ئەنجام بدات .

– بەیەکتریان وتوە (صۆفی) پیاو بوایە یان ژن .

– پیاوەکان لەجیاتی تەوقە کردن دەستی یەکتریان ماچ دەکرد .

– پیاوەکان ڕیشیان نەدەهێشتەوە .

– (مرۆت قادر کانی تویی) کە بە (جەرگە) ناسراو بووە، ماوەی بیست ساڵ لەماڵ نەچۆتە دەرەوە تاوەکو کۆچی دوایی کردووە.

## بەشێك لەمێژووی گوندی ( هەنارۆك ) زێدی حەماغا.

(هەنارۆك، بەردبەرد، وەستا سێمان)، ئەم سێ شوێنە موڵكی (بابەكری عەباسی حەمەداغای گەورە/ میراودەلی) بوون، بابەكراغا چوار كوڕێ هەبووە بەناوەكانی (حەماغای هەنارۆك)، (گولاڵویاغای بەرد بەرد)، (هەباساغای وەستا سێمان)، (محموداغای بەرد بەرد)، دوای كۆچی دوایی كردنی (بابەكراغا)ی باوكیان ئەو چوار برایە موڵكەكانی ئەم سێ شوێنە بەسەر خۆیاندا دابەش دەكەن، كە هەنارۆك) بەر (حەمەداغا) دەكەوێ، (بەردبەرد)یش بەر (گولاڵویاغا) و (محموداغا) دەكەوێ، (وەستا سێمان) بەر (هەباساغا) دەكەوێ .

محموداغایان لەتەمەنی ٢٥ ساڵیدا كۆچی دوایی كردووەو كەكوڕێك بەناوی (بابەكر) و كچێك بەناوی (ئایشە) لەپاشی بەجێ دەمێنێ، هەباساغاش تەنها كچێكی هەبووە بەناوی (پیرۆز) .گولاڵویاغاش كوڕێكی هەبووە بەناوی (عبدالله)، حەماغای هەنارۆكیش سێ كوڕی هەبوون بەناوەكانی (محمدأمین، علی، بابەكر) كەئێستاكە تەنها (بابەكر)یان لەژیاندا ماوە كە ئەویش خاوەنی دوو كوڕە بەناوەكانی (لەشكر، پشدەر) و حەوت كچ.

٦- چۆڵ كردن و ڕاگواستنی دووەم جار: لە (١٩٨٩/٦/١) بۆ (١٩٨٩/٦/٢٠) ئەم سێ دێیەش لەگەڵ تەواوی ناوچەی پشتدەر ڕادەگوێزرێن و لەئۆردوگای بازیانی دووی سلێمانی نیشتەجێ دەكرێن .

## ڕەچەڵەكی ( حەماغا ) ی پشدەر

(حەماغای پشدەر لە هۆزی (میراودەلی)یە و كوڕی بابەكری هەباسی حەماداغای میراودەل) بووە، كە بە (حەماغای هەنارۆك) ناسراو بووە، مێژووی لەدایكبوونی بەتەواوی نازانرێ، لەساڵی ١٩٥٢ كۆچی دوایی كردووەو لەگۆڕستانی گردی (شێخ وسوی پێماڵك) بەخاك سپێردراوە و بەداخەوە هیچ وێنەیەكی لەپاش بەجێ نەماوە، لەدوای خۆی كوڕێكی لەپاش بەجێماوە بەناوی (بابكر) كەئێستاكە لە (هەنارۆك) نیشتەجێیە و لەدایكبووی ساڵی ١٩٥١ ە، حەماغا بە (حەماغای هەنارۆك) ناسراو بووە، كە ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆئەوەی كە (بابەكراغا) باوكی حەماغا چوار كوڕی هەبووە بەناوەكانی (حەماغا، گولاڵوی ئاغا، محمود ئاغا) ئەم سێیانە لەدایكێك دەبن . دوای كۆچی دوایی (پیرۆت ئاغا)یەك بابەكراغا ژنەكەی مارە دەكاتەوەو كوڕێكی لێ بووە بەناوی (هەباس)، دایكی هەباس پێشتر كوڕێكیشی لەپیرۆتاغای هاوسەری یەكەمی هەبووە بەناوی (ڕەسواغا) كەزەوی زارەكانی ناسراو بە (وەستا سێمان) لەنێو ئەو بەرەبابە دابەش دەكرێت گوندی (حەسار) لەلایەن (ڕەسوی پیرۆتاغا) ئاوەدان دەكرێتەوە كە بەر ئەو دەكەوێ و لە(وەستا سێمان)یش پارچە موڵكێكی بەردەكەوێ كەئاشی ئاوی لێ دادەمەزرێنێ و بە (ئاشی ئاوی ڕەسواغا) دەناسرێ. حەماغاو محموداغاو گولاڵویاغاو هەباساغاش كەبرا بوون ئەوانیش زەوی زارەكان لەنێو خۆیاندا دابەش دەكەن كە حەماغاو هەباساغا موڵكەكانیان بەسەر یەكەوە دەبێ گوندی (هەنارۆك) ئاوەدان دەكەنەوە . محموداغاو گولاڵویاغاش موڵكەكانیان بەسەر یەكەوە دەبێ و گوندی (بەرد بەرد) ئاوەدان دەكەنەوە .

## کەسایەتی حەماغا

وەکو بەڕێز (حاجی حمەدی سۆفی ئایشێ قەڵادزێیی) کەهاسەردەمی حەماغا بووە بۆی باسکردین:حەماغا کەسێکی هێدی و هێمن بووە و زوڵمی لەکەس نەکردووەو پێش ئەوەی ببێتە هەقە کەسێکی بەدین بووە، بەلآم بۆ کاسبی کەسێکی زۆر کاسب نەبووە.

## حەماغا چۆن بووە بەمریدی ( شێخ عبدالکریمی شەدەڵە ) ؟

کەناوبانگی شێخ عبدالکریمی شەدەڵەو بزووتنەوەی هەقە بلآو دەبێتەوە حەماغا لەگەڵ (صۆفیاغا میر تاژدین) سەردانی شەدەڵە دەکەن و دواتر دەبن بە هەقەو مریدی شێخ عبدالکریمی شەدەڵە، ئیتر لەوکاتەوە کەدەبن بەهەقە دەست لەنوێژو ڕۆژوو هەڵدەگرن. هەروەها دەگوترێ: (صۆفیاغا میر تاژدین) کە دەبیستێ شێخ عبدالکریمی شەدەڵە نوێژ و ڕۆژووی لەسەر خەڵك هەڵگرتووە، گوایە بەنیازی کوشتنی دەچێت بە سەردانی بەلآم لەوێ کە گوێبیستی قسە و گوتاری شێخ عبدالکریم دەبێت یەکسەر دەبێ بە (هەقە).

## وەسیەتەکەی شێخ عبدالکریمی شەدەڵە بۆ حەماغا

گوایە کاتی خۆی (شێخ عبدالکریمی شەدەڵە) بە (حەماغا) ی ووتوە: لەپشتدەرێ مەبزوو ئەگەر ئاوی تۆفانیش بێ چونکە ئەگەر ببزووی تێدا دەچی. دوای کۆچی دوایی شێخ عبدالکریمیش مریدەکانی زۆر لەحەماغا دەکەن کە لەگەڵیاندا بچێ سەردانی شەدەڵە بکات، ئەویش دەڵێ: لێمگەڕێن ناچم لەبەرئەوەی شێخ وەسیەتی کردووە کە لەپشتدەرێ نەبزووم، دواجار لەگەڵ خۆیاندا دەیبەن کە بیست کەسێکی کانی تویی لەگەڵدا بووە کە دەگەڕێنەوە (هەناروك) لەرزو تا دەیگرێ و دوای سێ ڕۆژ کۆچی دوایی دەکات .

## دوای شێخ عەبدولکەریم حەماغا بانگەشەی جێنشینی بۆخۆی دەکات

## ئەمنیش خەلیفەم و جێی شێخ عبدالکریم دەگرمەوە

لەدوای کۆچی دوایی کردنی شێخ عبدالکریم حەماغاش ئەم قسەیە دەکات و باڵێك جیا دەکاتەوەو بە (حەماغایی) دەناسرێن، پەیڕەوەکانیشی بەزۆری لەگوندی (کانی توی مەرگە) بوون.

## بۆچی حەماغای پشدەر پێی گوتراوە ( حەمە جنددار )؟

بەهۆی ئەو بیرو باوەڕەی هەقە کە حەماغا هەڵیگرتووەو باسی کردووەو لەمیانەیدا نوێژو ڕۆژوشیان نەکردووە دیارە ئەم شتە بەلای خەڵکەکەی نامۆ بووە و بۆیە وتویانە: حەماغا لەگەڵ جندان تێکەڵ بووەو ناوی لێنراوە (حەمە جنددار).

## ڕای حەماغا سەبارەت بە نوێژ و ڕۆژوو.

گوایە حەماغا وتویەتی: بەکەس ناڵێم نوێژێ مەکەو کەسیش ناچێتە قەبری کەس .

(مینەی گۆجەی کانی توو) کەکەسێکی سادە بووەو سەر بەهیچ لە باڵەکانی هەقە نەبووە، جارێکیان بەهۆی ئەوەی کە سەرەی فەحصی توتنەکەی لە (قەڵادزێ) دوا دەکەوێ بۆمانەوە شەوەکەی دەچێتەماڵی حەماغا لە

(هەنارۆك)، شەو بەحەماغا دەڵێ: دەڵێن نوێژان ناکەی؟ بۆچی نوێژان ناکەی؟ حەماغاش لەوەڵامدا پێی دەڵێ: بەکەس ناڵێم نوێژێ مەکە کەسیش ناچێتە قەبری کەس، لەگەڵ ئەوەشدا کەحەماغا نوێژی نەکردوون بەڵام بەردەوام سێ بەرماڵ لەدیوەخانەکیدا هەڵواسرابوون .

## حەماغا نۆ ژنی هێناوە کەدوانیان لەیەك ڕۆژدا بۆی گوازراونەتەوە.

بەرێز (بابەکری حەماغا) وتی: حەماغای باوکم (٩) ژنی هێناوە کە یەکەم ژنی (گوڵەی بایزاغای وەسوێنێ) بووە کەکوڕێکی لێ بووە بەناوی (حمدأمین)، دووەم ژنی (ئایش – لەبنەماڵەی صۆفیەکانی سیکەنە) کەکوڕێکی لێیی بووە بەناوی (علی)، ژنی سێیەمی (بەدری) خەڵکی کانی تووی مەرگە بووە، چوارەم ژنی بەناوی (حەبەخان ی مینەی فەقێ ئەحمەدی) خەڵکی (کانی توو)ی مەرگە بووە کەئافرەتێکی گۆج بووەو لە هەنارۆك مردووە، پێنجەم ژنی بەناوی (ئایش حمدأمین فەقێ ئەحمەد) خەڵکی کانی تووی مەرگە بووە، شەشەم ژنی بەناوی (ئایشە گوڵ علی حسێن) خەڵکی کانی تووی مەرگە کەدوای مردنی حەماغا دەگەڕێتەوە کانی توو بە (شێخ ئایش) دەناسرێ، حەوتەم ژنی بەناوی (هەمین مینە شاڵی) خەڵکی کانی تووی مەرگە بووە کەدوای مردنی حەماغا دەگەڕێتەوە گوندەکەی و شوو دەکاتەوە – کەدایکی بابکری حەماغا بووە، هەشتەم ژنی بەناوی (حەلاوێ مام پاشای) خەڵکی کانی تووی مەرگە بووە کەلەگەڵیدا نەگونجاوەو ئەویش ناردویەتەوە بۆماڵی باوکی. گوایە (ئایشە حمدأمین) و (هەمینی مینە شاڵی) کەخەڵکی (کانی توو) بوون بەیەك ڕۆژ بۆی گوازراونەوەو براون بۆ (هەنارۆك)، کە هەریەکێکیشیان چوار سەر بزنی مەرەزو چەند کیس گوێزو بایەو مێوژ و باسوقیان لەگەڵ خۆیاندا بردووە .

بەداخەوە ناوی ژنی نۆیەمی لەیاد نەمابوو .

## دیاریەکانی موریدەکانی کانی توو بۆ حەماغا

بەڕێز (مستەفای مینە شاڵی – کانی تویی) باسی ئەوەی کرد، جارێکیان لەلایەن مریدەکانی (کانی توو)ەوە چل سەر بزنی مەرەزو یەك تفەنگی برنۆ بەدیاری دەبرێ بۆ (حەماغا).

## پێشبینییەکی حەماغا وەکو خۆی دەرنەچوو،

(ئەحمەدی صۆفی ئایشێ قەلادزێیی) بۆی باس کردین و گوتی: (سندۆڵ) پارچە زەویەکی حەماغا بووە لە (هەنارۆك) کەلایەکی ئەو زەویە شێدار بووە واتە تەڕایی ئاوی لێبووە، حەماغا بیری کردۆتەوە ئەگەر بێت و بەدوای ئەو تەڕاییەدا بچێ ڕەنگە ئاوەکەی زیاد بکات. ئەگەر ئاوی پێویستیشی لێ پەیدا بوایە ئەوا ڕووبەرێکی بەرفراوانی زەوی زارەکانی بۆ بەراو دەبوو، بۆ ئەو مەبەستەش مریدەکانی (کانی توو) هەڵدەستن بەکارکردن لەوشوێنە شێدارەو خەندەکێکی (١٥) مەتر درێژ هەڵدەکەنن، کەچی نەك هەر نەگەیشتبوونە ئاوو ئاوەکەی زیادی نەکرد بەڵکو ئەو ئەو تەڕاییەی کە هەشی بوو وشکی کرد. وێڕای ئەوەی کەشەوو ڕۆژ کاریان تێدا دەکرد. هەروەها ناوبراو زیاتر دەیگوت: لەکاتی دەست بەکاربوونی کارکردن لەوشوێنە شێدارە بەمەبەستی زیادبوونی

ئاو (صۆف پیرۆز)، (صۆفی ئایشی حەساریٚ)، (صۆفی مەنیجیٚ پیٚماڵکیٚ) دەیانگوت: (حەزرەتی مەهدی) خەونی دیوە کەئاویٚکی لیٚ پەیدا دەبیٚ ئاشی لەبەر دەگەڕیٚ، کەچی ئەوەندە ئاوەش کە هەیبوو وشکی کرد.

(مستەفای مینە شاڵی کانی تویی) لەدایکبووی ١٩٤١ کەئیٚستاکە لەناحیەی (حاجیاوا)ی (بیتویٚن) نیشتەجیٚیە و برای (هەمین) یەکیٚ لەهاوسەرەکانی حەماغا بۆی باسکردین کە: (هەمینی مینە شاڵی) خوشکی کەهاوسەری حەماغا بووە نویٚژو ڕۆژووی دەکردن ئەوکاتەی کەلای حەماغاش بووە، ئامینی دایکی هەمین جاریٚك دوو بزن و نیٚریەك بەدیاری دەبات بۆ حەماغا، هەموو ساڵیکیش (کانی توویيەکان) درویٚنەی گەنمیان بۆ حەماغا دەکرد، هەروەها توتنیشیان بۆ دەچەقاندو بۆ پیٚوە دەکرد.

## نیشانەکانی نەفس شکاندنەکەی گولاٚویاغا

(صۆفی گولاٚوی – کەبرای حەماغا هەنارۆك بووە و مریدی شیٚخ عبدولکەریمی شەدەڵە بووەدەوتریٚ بۆ نیشاندانی نەفس شکاندنی خۆی نانی لەسەر سەرانگویٚلك خواردووە و کە بەسواری کەر چووە بۆ قەلاٚدزیٚ بەناو بازاڕەکەیدا پاشەوپاش (پیٚچەوانە) سواری کەرەکەی بووە و ژنان بۆ مەبەستی مندالٚ بوون داوایان لیٚدەکرد پارچەیەك لەدیٚخونەکەیان بداتیٚ، ئەویش وتویەتی: بۆخاتری خوا منداڵتان نەبیٚ، کەچی وابووە منداڵیان بووە .

## چارەنووسی باڵی حەماغایی:

دوای مردنی حەماغا لە ١٩٥٢ هیچ کەسیٚك شویٚنی ئەوی نەگرتۆتەوە و ئیٚستاکەش کە ساڵی ٢٠١٨ یە هیچ کەس لەموریدەکانی لەژیاندا نەماون.

## بــــــەشــــى: حــەوتـــەم

### صـۆفـيـاغـاى مـيـرتــاژديــن خاوەن دوو كە سيايەتى جياواز.

١- سۆفياغاى ميرتاژدين كێ بووە؟

٢- سۆفياغا يەكەم جار بەنيازى كوشتنى شێخ عبدولكەريم دەچێتە شەدەڵە.

٣- سۆفياغا بەر لەوەى ببێتە هەقە كەسێكى چۆن بووە؟

٤- دواى ئەوەى سۆفياغا دەبێتە هەقە چۆن بووە؟

٥- سۆفياغا باوەڕى بەحكومەتى بێگانە نەبووە.

٦- سۆفياغا خەڵكى بۆ نوێژكردن هانداوە بەلاٌم پاساوى بۆخۆى هێناوەتەوە.

٧- سۆفياغا باوەڕى بەحەج كردن نەبووە.

٨- سۆفياغا گوتويەتى: باشتر وايە تۆ لەگەڵ ڕۆژگاردا بڕۆيت.

٩- سۆفياغا چەند كەسايەتێكى هەقەى بەشداربووى كۆمارى كوردستانى داڵدە داوە.

١٠- كێشەى زەوى زار لەنێوان سۆفياغا و خاوەن موڵك.

١١- بەسۆفياغاگوتراوە: بەحساب تۆبەت كردووە كەچى موڵكى خەڵكيت داگير كردووە.

١٢- گوتەكانى سمايلاغاى ئالاٌوێ لەبارەى سۆ فياغاوە.

١٣- گوتەكانى خزمەتكارەكەى سۆ فياغا لەبارەى سۆفيا غاوە.

## سۆفیاغای میرتاژدین کێ بووە؟

(صۆفیاغای میرتاژدین) ناوی تەواوی (محمودی کوڕی باپیری صالحی حەمەداغای میرئاودەل) لە (هۆزی میراودەلی پشدەر) ساڵی لەدایك بونەکەی نازانرێ بەڵام ساڵی ١٩٧٣ کۆچی دوایی کردووەو لە گۆڕستانی (کلاو سپیان- ی ئالاوێ) بەخاك سپێردراوە، بەداخەوە هیچ وێنەیەکیشی لەپاش بەجێ نەماوە، یەکەمجار مەڕدار بووەو لە (نێوکێل) ی نێوان گوندەکانی (سەیدەحمەدان و ڕیشوان) دەژیا، ئینجا لە گوندی (کۆشکەڵێ) و دواتریش دەچێ بۆ گوندی (ئاشی زادە) و لەوێشەوە لە شوێنی ناسراو بە (میرتاژدین- باشوری گوندی شێخ ئاودەلان) نیشتەجێ دەبێت کە ئەو شوێنە موڵکی خۆی نەبووە بەبێ ڕەزامەندی خەڵکی گوندەکە لێی جێگیر دەبێت تا کۆچی دوای دەکات.

## سۆفیاغا یەکەم جار بەنیازی کوشتنی شێخ عبدولکەریم دەچێتە شەدەڵە.

وەکو کاك (عبدالله ی صۆفیاغای کۆشکەڵێ) بۆی باس کردین: کاتێ باوکی ناوبانگی (شێخ عبدالکریمی شەدەڵە) دەبیستێ لەگەڵ (حەماغای هەنارۆك) و (حەمەی عەلیاغای سەردەشت) دەچێ بۆ شەدەڵە، گوایە سەرەتا بەنیازی کوشتنی (شێخ عبدالکریم) دەچێ، بەڵام کە لەشەدەڵە دەمێنێتەوە دەبێتە مریدو هەر لەوێ تفەنگ و دەمانچەکەی بەخانەقای شەدەڵە دەبەخشێ، ئیتر کەدەگەڕێتەوە بۆ دوورە پەرێزی و گۆشەگیر بوون ماڵەکەی دەباتە (میر تاژدین) کەشوێنێکە لەسنوری گوندی (شێخ ئاودەلان)دایە.

## سۆفیاغا بەر لەوەی ببێتە هەقە کەسێکی چۆن بووە؟

وەکو کاك (محمودی سمایلاغای ئالاوێ) باسی کرد: صۆفیاغا پێش ئەوەی ببێتە مریدی شێخ عبدالکریم کەسێکی دونیایی بووەو زۆر گرنگی داوە بەڕوخسارو ڕواڵەتی هەتا ئەگەر پێڵاوەکانی ڕەنگیان ڕەش بوایە دەبوایە کولەجەو پانتۆڵ و فیشەکدانەکەشی هەر ڕەش بوایە. جیا لەوەش وەکو باس دەکرێ صۆفیاغا کەسێکی زۆر ئاقڵمەند بووەو دوای تۆبە کردنەکەشی (ئاغا میراودەلیەکانی پشدەر) هەروەکو کەسایەتیەکی ماقوڵ حسابیان بۆ کردووەو پرس و ڕاوێژیان پێی کردووە . هەروەها وەکو (حاجی حمدی صۆفی ئایشێ) بۆمانی باس کرد و دەیوت: زۆرجار گوێم لەصۆفیاغا بووە کەدەیگوت: ئەوەندەم زوڵم کردووە مەگەر خوا بۆخۆی لێم خۆش بێ.

## دوای ئەوەی سۆفیاغا دەبێتە هەقە کەسێکی چۆن بووە؟

دوای ئەوەی صۆفیاغا دەبێتە هەقە وەکو ڕواڵەت دەستبەرداری خۆشی ژیانی دونیا دەبێ و دەوترێ لەکاتی نوستن لەجیانی سەرین سەری دەخستە سەر بەردێك یان کۆلکە دارێك و ژیانی ئاغایەتی و خۆشگوزەرانی وەلا دەنێ، بۆ ئەشکەنجەدانی جەستەی خۆشی چۆغەی بەتەنیا لەبەر دەکردو کەپەنکێکی شوانانەشی بەسەر خۆیدا دەدا.

## سۆفیاغا باوەڕی بەحکومەتی بێگانە نەبووە.

وەکو (کاک عبداللە ئاغای کۆشکەڵی کوڕی سۆفیاغا)ی کوڕیٚ باسی کرد: لەسەردەمی مەلیك فەیسەڵی عێراقدا دوو لەکوێخاکانی گوندی (هەڵشۆ) بەناوەکانی (کوێخا حەسەنی حاجی هەمزەی) و (کوێخا سلێمان) کۆبۆنی خۆراکی بۆ دەبەن کە لەلایەن حکومەتەوە بۆ هاولاتیان دەرچووبوو، صۆفیاغا ئەو کۆبۆنە وەرناگریٚ و دەڵیٚ: شتی هیچ حکومەتێکی وەرناگرم مادام بێگانە بیٚ. هەروەها ساڵی ١٩٥٧ یش کەدەچنە لای بۆ ناونوس کردن صۆفیاغا ڕازی نابیٚ و ناوی خۆی تۆمار ناکات، کەوەکو (کاک عبداللە ئاغا) ی کوڕی باسی کرد دواتر ئەو ناو تۆمار نەکردنەی دەبێتە کێشە لەڕووی ڕەگەزنامەوە بۆیان.

## سۆفیاغا خەڵکی بۆ نوێژکردن هانداوە بەڵام پاساوی بۆخۆی هێناوەتەوە.

(کاک عبداللە ئاغا)ی کوڕی دەیگوت: باوکم بۆ نوێژەکان ئاگاداری دەکردمەوە کەبیان کەم، کەپێشم دەگوت: ئەدی بۆچی بۆخۆت نوێژان ناکەی ؟ لەوەلأمدا دەیگوت: عوزری شەرعیم لیٚ پەیدا ـ بووە نوێژم بۆناکریٚ .

هەروەها دەیگوت: ساڵی ١٩٦٣ کەجاشەکانی (شێخ ڕەشیدی لۆلان) لەگەڵ سوپای ڕژێمەکەی (عبدالسلام عارف) هێرش دەکەنە سەر گوندەکانی سنوری (سەرچۆمی ئالأویٚ و هەڵشۆ) لە (میرتاژدین) پرسیار لە صۆفیاغا دەکەن کەئایا ئەو سنورە پێشمەرگەی لێیە یان نا؟ صۆفیاغاش دەڵیٚ: لێی نین، ئیتر جاشەکان پێشڕەوی زیاتر دەکەن بۆ گوندی (شێخ ئاودەلان و گولأن) لەویٚ بەرەو ڕووی پێشمەرگە دەبنەوەو چوار جاشیان لیٚ دەکوژرێن و کە بەتێشکاوی لەبەرەی شەڕەکە دەگەڕێنەوە دەچن لولەی تفەنگ دەکێشن بە کەلەکەی صۆفیاغا داو لەوەوە تووشی نەخۆشی میزڵدان دەبیٚ و دواجار لەساڵی ١٩٧٣لە (میرتاژدین) کۆچی دوایی دەکات و لەگۆڕستانی (قەبری کلأو سپیان) ی (ئالأویٚ) بەخاك دەسپێردریٚ .

## سۆفیاغا باوەڕی بەحەج کردن نەبووە.

(عبداللە ئاغا) ی کوڕی صۆفیاغا بۆی باسکردین: ساڵێك (صۆفی فەتاحی قەلأدزیٚ) (ئەحمەدی صۆفی مەنیجیٚ) دەنێریٚ بۆلای صۆفیاغا پێی دەڵیٚ: کەبا پێکەوە ئەمساڵ بچین بۆ حەج، صۆفیاغا بەنێردراوەکەدا بەم هۆنراوە وەلأمی دەداتەوە:

**ئەحمەدی کۆر بەس خەیاڵکە**
**حوببی دنیایی بەتاڵکە**
**یەکیٚ بگرەو یەکیٚ تەلأق دە**
**پێکەوە نابن دوو هەویٚ**

## سۆفیاغا گوتویەتی: باشتر وایە تۆ لەگەڵ ڕۆژگاردا بڕۆیت.

(عبدالله ئاغا)ی کوڕی دەیگوت: زۆرجاریش ئەم هۆنراوەیە (سەعدی شیرازی) دەگوتەوە کەدەڵێ: (**ئەگەر زەمان بەتۆ نەیایەد، بایەد شومارا به زمان برەوید**)، واتا: ئەگەر ڕۆژگار لەگەڵ تۆدا نەیەتەوە پێویستە تۆ لەگەڵ ڕۆژگاردا بڕۆیت.

### .سۆفیاغا چەند کەسایەتێکی هەڤەی بەشداربووی کۆماری کوردستانی داڵدە داوە

(عبدالله ئاغا)ی کوڕی دەیگوت: دوای ڕووخانی کۆماری مهاباد (شێخ حمدأمینی مەڵحە) و (شێخ حەسەنی عەسکەری) و (حەمە ڕەشیدی گەورە دێ) و (سمە قوچی کەلکەسماقی) کە دەگەڕێنەوە بۆ کوردستانی عێراق شەوێك لەگوندی (زێوەی سەردەشت) دەمێننەوە و لەمزگەوتەکەیدا دەخەون. بەیانیەکەی خەڵکی دێیەکە چەکەکانیان لێ دەستێنن و ئەوانیش دەگەڕێنەوەو دەچنەلای (صۆفیاغا). صۆفیاغاش (باپیراغا ی کوڕی) و (برایمی هەباسی تەنگژە) و (ئەحمەدی صاڵحاغای بێشیر) دەنێرێ کەبچن لەتۆڵەی ئەوە مەڕی (زێوەییەکان) بەتاڵان بهێنن ئەوانیش دەڕۆن و مەڕی گوندەکە دەهێنن، دوای ئەوە خەڵکی دێیەکە چەکەکان دەهێننەوەو مەڕەکانیان دەدرێتەوە، بەهۆی داڵدەدانی ئەو چوار کەسەش صۆفیاغاش لەحکومەتی عێراقی قاچاغ دەبێ تاوەکو ساڵی ١٩٥٠ کە لەلایەن حکومەتی عێراقیەوە تەبریە دەبن و چوار میوانەکەی دەگەڕێنەوە ناوچەکانی خۆیان .

### کێشەی زەوی زار لەنێوان سۆفیاغا و خاوەن موڵك.

زەوی زارەکانی کە لایەکی پێی دەگوترێ (میر تاژدین) لایەکەی تریشی پێی دەگوترێ (نزێری) بریتین لە زەوی زاری بەراو و پشتاو و کەوتونەتە کۆتایی سنوری موڵکەکانی (شێخ ئاودەلەییەکان) لەباشوری گوندی (شێخ ئاودەلان). شێخ ئاودەلەییەکانیش کە بە (مەلا زادە) ناسراون تیرەیەکی سەربەخۆن و باپیرەکەیان کەناوی (شێخ ئاودەل) بووە یەکەم جار ماڵی بردۆتە شوێنی کانی و ئاوەکەی ئێستای گوندەکەو لێی نیشتەجێ بووە، ناوبراو سێ کوڕی هەبووە کەناویان (فەقێ حمد، سورە، بۆرە) بووە، کەوا خەڵکی گوندەکەش بەو هۆیەوە بریتین لەبەرەبابەکانی (فەقێ حمدی، سوران، بۆران) . ئەوکاتەی کە (شێخ ئاودەل) بەتەنیا ماڵی لەوشوێنە دەبێ بۆیەش گوندەکە ناوی لێ دەنرێ (شێخ ئاودەلان) و گوایە فەرماندەیەکی (دەوڵەتی تورکی عوسمانی) بەو سنورەدا ڕەت دەبێ و بۆ حەسانەوەو پشودان و نان خواردن لادەداتە لای ئەم شێخ ئاودەلە و کەنیوەڕۆ دادێ شێخ ئاودەل دەیەوێ نانێکی تایبەتی بۆ فەرماندەکە ئامادە بکات، بەڵام فەرماندەکە پێی دەڵێ: پێویست بەهیچ شتێك ناکات و چی هەبێ ئەوە دەخۆین، دوای نانخواردنەکە فەرماندەکە دەڵێ: تاکو ئێستا نانی ئاوا بەتام و لەزەتم نەخواردووە. لێرەدا وەکو چاکەیەك بە شێخ ئاودەل دەڵێ: کوێ و کوێت بۆ لەسەر تاپۆ بکەین ؟ شێخ ئاوەدەلیش دەڵێ: هەر ئەو دەوروبەرەی کە لەدەوری ماڵەکەمە، فەرماندەکەش پێی دەڵێ ئەوە کەمەو سنوری میرتاژدینیشی لەسەر تاپۆ دەکات کەئێستاکەش شێخ ئاودەلەییەکان بەڵگەی تاپۆی عوسمانی ئەو شوێنەیان لەبەر دەستدایە.

## بەسۆفیاغا گوتراوە: بەحساب تۆبەت کردووە کەچی موڵکی خەڵکیت داگیر کردووە.

کە صۆفیاغا دواجارماڵی دەباتە (ئاشی زادە) یان هەر ئەوساڵە یان ساڵێك دواتر ماڵەکەی دەباتە (میرتاژدین) و لەبن قەلاَتەکەی میرتاژدین لەکن کانیاوەکەی خانویەکی سادە دروست دەکات بە مەڕو ماڵاَتەکەیەوە لەوێ نیشتەجێ دەبێ و دەست دەگرێ بەسەر تەواوی ئەو زەوی زارانەدا، کەساڵانە بەشێکی بەتەنیا خۆی دەیکردن بەکشتوکاڵ و بەشێکیشی دەدا بە (هەڵشۆییەکان) (بەنیوەیی). کە بەبێ ڕەزامەندی خاوەنی زەوی زارەکان لەوێ نیشتەجێ دەبێ،بەلاَم بەهۆی ئەوەی کە شێخ ئاودەلەییەکان دەسەلاَتیان نابێ ناچار بێدەنگ دەبن، لەوبارەوەش بەڕێز (حاجی حەسەنی شێخ ئاودەلان) کەبەتەمەنترین پیاوی گوندەکەیە بۆی باسکردین و دەیگوت: زۆرجار بەصۆفیاغام دەگوت: باشە تۆ بەحیساب تۆبەت کردوە ئەدی چۆن موڵکی خەڵکی داگیر دەکەی؟ ئەویش لەوەلاَمدا دەیگوت: **هاهوو... هاهوو**، هەروەها دەیگوت: دە شوێنێکی چاترم بۆ بدۆزنەوە تاکو بچمە ئەوێ .

**پرسیار**: ئایا (صۆفیاغا) پێش ئەوەی بچێتە (میرتاژدین) و لێی نیشتەجێ بێت پرسی بە (شێخ ئاودەلەییەکان) کرد، کە یان ڕێگەم پێبدەن یان پێم بفرۆشن ؟

**حاجی حسن**: نەخێر .

**پرسیار**: ئایا ساڵانە صۆفیاغا زەکاتی شەرعی کەلێ دەرکردووە دەیدایەوە بەخاوەن موڵکەکان یان نا؟

**حاجی حسن**: نەخێر نەیدەدایەوە بەئێمە .

ئەم بارودۆخەی دەست بەسەرداگرتنی زەوی زارەکانی ئەم شوێنە بەردەوام دەبێ تاساڵی ١٩٧٠ کە ئەوکات شۆڕشی ئەیلول هەڵدەستێ بە جێبەجێکردنی (یاسای ژمارە (٩٠)ی ئیصلاحی زراعی) بەوهۆیەوەزەوی زارەکان دەگێڕنەوە بۆ خەڵکەکە .

## گوتەکانی سمایلاغای ئالاَوێ لەبارەی سۆفیاغاوە

(سمایلاغای ئالاَوێ) لەدایکبووی ساڵی ١٩١٢ گوتی: من برایەکم هەبوو نێوی (عەولاَغا)بوو مڵکمان لەگەڵ یەکدی بەش نەکردبوو، کاتێك صۆفیاغالەدوای تۆبەکردنەکەی کە لە(ئالاَوێ) بوو داوای لەمن کرد موڵکی (میرتاژدین — یانزێری) بەئەمانەت بدەمێ و گوتی: لەبەرئەوەی شوێنێکی چۆڵەوانی و لاچەپەکە پێم خۆشە بەمەڕ و ماڵاَتەوە لەوێ بژیم کە مەڕێکی زۆری هەبوو جیا لەمانگاو گاجوت، برایەکەشم ڕازی نەبوو کەصۆفیاغا بچێتە ئەو شوێنە، منیش لەبەرئەوەی خۆشم دەویست دەمگوت: هەردەبێ بچێتە ئەوێ، دواجار براکەم گوتی: با ماڵێ خۆ بکەین و مڵکان بەش کەین وابوو (نزێری) بەر بەشی من کەوتوو منیش دام بەصۆفیاغا، لەبەرئەوەش برایەکەم نەیدەویست ئەوشوێنە بدەین بەصۆفیاغا چونکە صۆفیاغا مەڕو ماڵاَتی زۆربوو زەڕی خەڵکی (ئالاَوەو ئاشیزادەو شێخ ئاودەلان)ی دەکرد، خەڵکەکەش شکایەت و سکالاَی دەهێنایە لای من. منیش لەصۆفیاغا توڕە دەبووم، وابوو جارێك صۆفیاغا زەڕی (حاجی حەمە لۆری) کردبوو کە لەهۆزی (مامەش) بوو، منیش صۆفیاغام غەرامە کردوو (١٠)دینارم لێ ستاندوو دامە ئەو کەسە . کەسەکەش پارەکەی بۆهێنامەوەو گوتی: زەڕەکە بایی هێندە نەبووە و منیش پارەکەم دایەوە صۆفیاغا . جارێکی دیکە گاجوتەکانی صۆفیاغا دەچنە سەر خەرمانی هەمان

کەس لەسەر جێخونەکەی وشەوێ تابەیانی لەخەرمانەکەی دەخۆن. ئەمنیش (کوێخا سوران و عەزیزی صۆفی عەولاّ شەیتانی و جوننەتی عەولاّ قیتەی هەڵشۆیی)م بردن بۆ سەر خەرمانەکە و لێم پرسین: کەئایا ئەوەی خواردویانە بەعەقڵ چەند تەنەکە دەبێ ؟ دیارە یەکیان گوتی (١٠٠) تەنەکە دەبێ، یەکی کەش گوتی: (٢٠) تەنەکە دەبێ، ئەمنیش بەمەزەندەی خۆم (٢٠) تەنەکەکەم بەلاوە پەسەندو ڕاست تر بوو، ئیدی (٢٠) دینار غەرامەی صۆفیاغام کردوو پارەکەم دایە خاوەنی خەرمانەکە، بۆ زانینیش ئەوکات یەك تەنەکە گەنم بە یەك دینار بوو. هەروەها ساڵی ١٩٧١ بەهاندانی (مام وسو دزەیی) کە(ئامر بەتالیۆنێکی هێزی کاوەی پشدەری شۆڕشی ئەیلول) بوو، شێخ ئاودەلەییەکان دەچن هەموو دارو دەوەنەکانی (میرتاژدین) ئەو شوێنەی کەصۆفیاغا لێی جێگیر بوو بوو دەبڕن هەتا ئەو دارەش کەصۆفیاغا بەزۆری لەبنی دادەنیشت، هەموو زەویەکانیشی دەکێڵن و تەنیا خانوەکەی دەمێنێتەوە .

**پرسیار:** ئایا لەبنەڕەتدا ئەو شوێنە کە (صۆفیاغا) لێی جێگیر بوو بوو کەپێی دەوترێ (میر تاژدین یان نزێری) ملّکی شێخ ئاودەلەییەکانە یان موڵکی ئاغا میراودەلیەکانە؟

**وەڵام:** بەگوێرەی تاپۆی عوسمانی موڵکی نزێری لەسەر عەولاّغای دۆڵەدزێیە، بەلاّم لەسەردەمی باپیرم (سمایلی برایماغای ئالاّوێ) ئەو موڵکە گۆڕدراوەتەوە بە (گردمەیتەری). ساڵێ (تەسویە)ش واتە ساڵی ١٩٥٩ (سەید ئەحمەدی سەید کەریمی کەستانێ) سوێندی بۆ لیژنەی تەسویەکە خوارد کەنزێری موڵکی ئالاّوێیە و ئیدی تەسویەش لەسەر ئێمە بڕیاری لەسەر دا. بەلاّم لەساڵی ١٩٧١ کە شۆڕشی ئەیلول یاسای ژمارە (٩٠)ی حکومەتی عیراقی بۆ زەوی زار لەکوردستان جێبەجێ کرد ئەو موڵکە لەسەر شێخ ئاودەلەییەکان دابەشکراو نوسرا، زیاتریش چونکە ئەو شوێنە بەدیوی شێخ ئاودەلاندایە، لەنەخشەی (تاپۆی سلێمانی)ش (میر تاژدین) هەر لەسەر (ئالاّوێ)یە بەلاّم لەنەخشەی (قەلاّدزێ) ئالاّوێیان ڕەش کردۆتەوەو شێخ ئاودەلانیان لەجێ نوسیوە.

یەکێ لەرۆژەکانی هاوینی ١٩٦٨یش دوو پێشمەرگەی (مام وسو دزەیی) کەلەڕێدا دەبن بەرێکەوت دوو فڕۆکەی ڕژێمکەی (ئەحمەد حسن بەکر) بەسەر ئاسمانی سنورەکەدا دەسوڕێنەوەو دوو پێشمەرگەکە بەدی دەکەن، پێشمەرگەکانیش لەبەرئەوەی شوێنێکی ڕوتەن دەبێ خۆیان دەگەیننە ناو گاڕانی ئالاّوێ کە لەکن ماڵی صۆفیاغای مۆڵ دەبێ، فڕۆکەکان بۆردومانی گاڕانەکە دەکەن و بەو هۆیەوە چواردە ڕەشە ولاّخ دەکوژرێن . هەر لەبارەی صۆفیاغاوە سمایلاغای ئالاّوێ دەیگوت: صۆفیاغا ڕۆن و گۆشتی نەدەخوارد. بۆ ئەشکەنجەدانی جەستەی خۆی لەبزوو کەواو کولەجەو ڕانکەو پشتێندی دروست دەکردوو قوماشی لەبەر نەدەکرد .

– کە دەچوومە سەردانی و کاتی نوێژەکان دەهات بەمنی دەگوت: هەستە نوێژەکەت بکەو بەلاّم ئەگەر بۆمنیشی دەکەی نامەوێ .

– صۆفیاغا چوار ژنی هێنابوو، کە هەر چوار ژنەکانیشی پێش خۆی مردون، خاوەنی سێ کوڕ بوو بەناوەکانی (باپیر، صالح، عبدالله) و سێ کچ بەناوەکانی (خەج، ئایش، مریەم).

– لەنێو خزمانی خەڵکی هەڵشۆ بەتایبەتی ئەگەر بۆ سوڵح و مەسلەتێك (سۆفیاغا) خۆی بۆی نەکرابا بچێ ئەوا

کلاْوەکەی دەنارد یان تەسبێحەکەی دەنارد بۆ مەجلیسی سوڵحەکە و ئیتر وەکو ئەوە وابوو کەخۆی ئامادەبێ و سوڵحەکە دەکرا.

– صۆفیاغا وەسیەتی کرد، کەمرد. تەنها من (سمایلاغای ئالاْوێ) بیشۆم و چوار کەسی هەڵشۆیشی بۆ گۆڕ هەڵکەندنەکەی دیاری کردن کەبریتی بوون لە (عەولاْ توڕەو، حاجی عەولاْ زەردو، حاجی مەلا سێن و، شەریفی ڕەسوی ئەستیێ) .

لەکاتی سەرە مەرگیشدا من گەیشتمە سەری و دەستم کرد بەخوێندنی چەند سورەتێکی قورئان لەسەری و ئینجا پێمگوت: مردوت مرێ شادەی بێنە دەمری، بەلاْم هەر ملی نەدەدا تادواجار ئەوەندەم لێ دووبارە کردەوە ئەوەبوو شایەتمانی هێنا و پاش کەمێك گیانی دەرچوو .

– لە ڕێوڕەسمی بەخاك سپاردنەکەشی تیکڕای پیاوەکانی گوندی (هەڵشۆ) و نزیکەی پێنج سەد لە (ئاغا میراودەلیەکان) ئامادەبوون ـ مامۆستا مەلا حەسەنی هەڵشۆیش تەڵقینی دا .

### گوتەکانی خزمەتکارەکەی سۆفیاغا ( شەریفی ڕەسوی ئەستیێ ی هەڵشۆیی ) لەبارەی سۆفیاغاوە

مام شەریف لەدایکبووی ساڵی ١٩٤٠ بۆی باسکردین و گووتی: لەبەر نەداری و هەژاری چوومە لای صۆفیاغا وەکو خزمەتکارێك و دوازدە ساڵان لەلای بووم. پێش ئەوەی صۆفیاغا بچێتە (میرتاژدین) ئەو شوێنە چۆڵگە بووە و دوای ئەوەی لەلای (شێخ عبدالکریمی شەدەڵە) تۆبە دەکات و دەبێتە هەقە لە(ئاشی زادە) وە دەچێتە ئەو شوێنەو بەپارەی خۆی کارێزە ئاوێکی لێ پەیدا دەکات و ئەوکات (شێخ ئاودەلەییەکان) کەسیان نەچووبوو بەرگری لێ بکات و بڵێن: موڵکی ئێمەیە. بەهۆی صۆفیاغاشەوە زەوی زارەکە دەکرا بەگەنم و هەروەها دارو دەوەنیشی لێ پەیدا کردن، گوندی هەڵشۆش وەکو ئیداری بەسەر سێ ئاغا دابەش کرابوو بۆ باج و بێگارو زەگات کەبریتی بوون لە:

١– صالْحاغای بێشیر: وەکو دەوترێ ئاغاکانی (بێشیر) بەبێوەژنەکانی گوندی هەڵشۆ بەچلەی زستان گەڵیان بەکۆڵ پێ گواستونەوە بۆ بێشیر. هەروەها دەوترێ لەگوندی هەڵشۆ تەنها (کوێخا مامە) لەتیرەی (فەلاحان) ملی بۆ باج و بێگارەکانی ئاغا نەداوە.

٢–حاجیاغای سەیدەحمەدان.

٣– صۆفیاغا کۆشکەڵێ: کەبەرەبابەکانی (کوێخا حەسەن) و نیوەی (مەلا سێنیان) بەر صۆفیاغا کەوتبون بۆ (باج و بێگار و زەکات).

**زەکات:** بریتی بوو لە پێدانی زەکاتی شەرعی لەبەروو بووم بەئاغا.

**بێگار:** بریتی بوو لەوە لەمانگێکدا سێ ڕۆژ دەبوایە بەبێ کرێ ئەندامێکی هەر ماڵێك ئیشوکاری کشتوکاڵی بۆ ئاغا کردبایە.

**باج:** بریتی بوو لەجەریمە، ئەگەر پیاوێك ژنی هەڵگرتبایە ئاغا جەریمەی کەسەکەی دەکرد بەلێ ستاندنی پێنج یان دە دینار.

–دوای تۆبەکردنەکەی و بوون بەهەقە صۆفیاغا بێگاری لەسەر خەڵکەکە هەڵگرتوو بە تەکلیف واتە بەداوا کردن

داوای لەخەڵك دەکرد بۆ ئیشوکار بۆکردنی، نانی باشیشی دەدا بەوکەسانەی کەئیشیان بۆ دەکرد بەنمونە (وسێنە سوری ئەحمەدە شەنگەی بێگەلاسی) کە لە ١٩٦١/٩/٨ لەچوونە سەری ئاغایەکان بۆ سەر گوندەکانی(دێلۆ و مێرتکە) کوژرا . هەموو ساڵێك بەهاوینان ئەگەر صۆفیاغا هەروەزی هەبوایە بارە بەفری بۆ دەهێنا بە تەکلیف و لەبەرانبەریشدا یان پارەی دەدایە یان جۆ کەپێشتر وانەبوو .

– سالأنە هەقەکانی گوندی (کانی تووی مەرگە) زوو زوو دەهاتنەلای صۆفیاغا و ئیشوکاریان بۆ دەکردوو خۆ بەخۆ لەناو مەڕەکانی صۆفیاغا دەیانگوت: ئەو مەڕە زۆر قەڵەوە دەیکوژینەوە (هەقە)، ئیدی مەڕەکەیان دەکوشتەوەو صۆفیاغاش هیچ قسەو بەرگری لەوە نەدەکرد .

– ئەگەر (جەڵەبکڕ) دەچوونەلای بۆ مەڕ و بزن و گاجوت کڕین پێی دەگوتن: بچۆ بۆخۆت بەئارەزووی خۆت هەڵبژێرەو پارەکەشی ئەوەندە دەکات و لەسەر بەردێکیشی دانێ، ئەگەر زەرەدت کرد بۆت دەبژێرمەوە، ئەگەر قازانجیشت کرد با بۆخۆت بێ. لەمامەڵەو سەودا کردنیشدا مشتومڕی قبوڵ نەبوو واتە ئەو نرخەی دایدەنا هەر ئەوەبوو .

– ڕۆژێکی ساڵی ١٩٦٣ سوپای ڕژێمی (عبدالسلام عارف) هێرشی هێنایە سنوری (شێخ ئاودەلان) کەبارەگایەکی پێشمەرگەی لێبوو. بەلأم ئەوڕۆژە پێش هێرشەکە چۆڵیان کردبوو ئەوەبوو عەسکەر هاتنە (میرتاژدین) و لەمنیان پرسی پێشمەرگەی لێن ؟ منیش گوتم: نەخێر و نەمزانی سێ پێشمەرگە لەنەدیوو گردەکان مابوونەوەو ئامادەی بەرگری کردن بوون، ئیدی ئەوەبوو عەسکەرەکان بەرەو سەروو پێشڕەویان کردوو پێشمەرگەکان تەقەیان لێ کردن و وابوو لەو نێوەشدا فڕۆکە هات و بەهەڵە بۆردومانی عەسکەرەکانی کرد کەچەند عەسکەرێك کوژران . کاتێك عەسکەرەکان کشانەوە دواوە بەلای مندا هاتن و جنێویان پێدام و سێ چوار قۆنداغە تفەنگیشیان لێدام و پێشیان گوتم: ئەدی بۆچی دەتگوت پێشمەرگەی لێنیە؟ ئەوەبوو صۆفیاغاش هاتە لای عەسکەرەکان و پێی گوتن: هەق نیە لەو پیاوەی بدەن، عەسکەرەکان کەوتنە لێدانی صۆفیاغاش، صوفیاغاش پێی گوتن ئەگەر ئێمەش بکوژن شێخ مستەفا – کە بەمەبەستی (مەلا مستەفا بارزانی) بوو لەهەقی خۆی واز ناهێنێ .

– بۆ بەشودانی کچەکانیشی دەیگوت: ئەگەر بۆ ڕەعیەت واتە جوتیارێکیش قەناعەت بکەن ئەمن مانع نابم .

– صۆفیاغا خۆی نوێژو ڕۆژووی نەدەکردوو دەیگوت: خوا غەزەبی لە من گرتووە، لەکاتی وادەی نوێژەکانیش کەسەکانی دەوروبەری دەنگدەداو پێی دەگوتن: هەستن بچن نوێژەکەتان بکەن .

– صۆفیاغا جگەرەو سیغاری دەکێشاو بە بەردئەستێ هەڵی دەکرد، توتنیشی لەکیسەی بزوو دەکرد .

– هەفتەی دووجار خۆی دەشۆری، سمایلاغای ئالأوێ سەری بۆ دەتاشی و ڕیشی بۆ ڕێکدەخست، بەردەوامیش ڕدێنێکی بستێك درێژی هەبوو .

– پێش مردنی وەسەیەتی کرد لە قەبرەستانی (شێخ وسوی ئاشیزادە) بینێژن و نان و کولیچەشی لەسەر ببەشنەوە .

## بـــــــەشـــــی هــــەشـــتــــەم:.

١- ئەو گوندەی لەیەك كاتدا سێ جۆر لە پەیڕەوانی هەقەی لێ بووە .

٢- بەشێك لەمێژووی گوندی كانی تووی بەری مەرگە.

٣- موریدەكانی شێخ عەبدولكەریمی شەدەڵە لەكانی توو.

٤- موریدەكانی حەماغا لەكانی توو.

٥- موریدەكانی مامە ڕەزا لەكانی توو.

٦- شەڕلەنێوان دوو لە پەیڕەوەكانی شێخ عەبدولكەریم و حەماغا.

٧- ئەو هەقەی بۆ ژن باڵەكانی خۆی گۆڕی.

٨- ئەو موریدانەی شێخ عەبدولكەریم لەكانی توو كە دەست بەرداری خۆشی ژیانی دونیا بوبون.

## گوندی ( کانی تووی مەرگە )

## ئەو گوندەی لەیەك کاتدا سێ جۆر لە پەیڕەوانی هەقەی لێ بووە .

ئەوەی ئێمە بزانین جیا لەگوندی (قەرانگوێی جافایەتی) کە لەیەك کاتدا مریدەکانی شێخ عبدالکریمی شەدەڵەو باڵی مامەڕەزاو باڵی حەمەسوری تێدا بووە، تاکە گوندێکی تریش گوندی (کانی توو) ی (ناوچەی مەرگە(یە کە لەیەك کاتدا لەدوای کۆچی دوایی کردنی شێخ عبدالکریمی شەدەڵە مریدەکانی ناوبراو و باڵی مامەڕەزاو باڵی حەماغای پشتدەری تێدابووە، وەکو لەباسی باڵی حەماغاییدا ئاماژەمان پێکردووە جارێکیان لەسەر دەمارگیری بۆ ڕێبەرەکەیان شەڕێك لەنێوان دوو لەپەیڕەوەکانی شێخ عبدالکریم و حەماغادا ڕوویداوە .

## بەشێك لەمێژووی کانی تووی مەرگە

گوندی (کانی توو) یەکێکە لەگوندەکانی ناوچەی مەرگە سەر بەناحیەی (بنگرد) قەزای دووکان، پارێزگای سلێمانی. گوندەکەش کەوتۆتە خۆرهەلاتی ناحیەکەو گوندی مەرگە، دوا گوندی ناوچەکەیە لەم هێڵەوە کەچیای (کوڕ کوڕ) لەدیوی (شینکایەتی) جیای دەکاتەوە، سەرچاوەی بژێوی گوندەکە بەهۆی ئەوەی کە خاکەکەی زیاتر چیایە زەوی کشتوکاڵی کەمە بەشێوەیەکی گشتی بریتی بووە لە ڕەزی ترێ و ترش و هەنار و گوێزو بادام و سێوو ئاڵوباڵو قەیسی، کە لەترێ مێوژو دۆشاوو باسوق و سجوقیان دروست کردووە، هەروەها وەختێك کەتوتن نرخی چاکی دەکرد توتنیشیان بەرهەم دێنا، بۆ دابینکردنی گەنم و جۆش زیاتر ترێ و مێوژو میوەیان بەسواری ولآخ دەبردە گوندەکانی دەشتەکەی (مەرگە و بیتوێن و هەتا دەشتی کۆیە) و سەر بەسەر دەیان گۆڕیەوە، سەرچاوەیەکی تری بژێوی گوندەکە بەخێوکردنی مالآت و بەتایبەتی بزنە مەرەز بووە، کە لەمووی بزنە مەرەز شاڵی ڕان کو چۆغەیان دروست کردووەو ئێستاکەش بوزو یان بزوی کانی توو بەناوبانگە، جیا لەوەش وەستا مەولودێك لەگوندەکە هەبووە کەساڵی ٢٠٠٤ کۆچی دوایی کردووە دار جگەرەو سەبیلەو سەبیل سیغاری لەداری قەیسی و عەنناب = سنجو دروست کردووەو لەناوچەکانی (بیتوێن و پشدەر و سلێمانی)ش ساغ دەبۆوە .

**بەرەبابەکانی گوندەکە :-**

کوردان، عوزێران، حەبوبەکری، سەید خدر، بەردەکەشك.

**ڕاگواستن و چۆڵکردنەکەی:**

**یەکەمجار:** لە ١٩٧٨/١٠/١٠ لەلایەن ڕژێمەکەی (ئەحمەد حسن بکر) ڕادەگوێزرێ و لەئۆردوگای (تەوسوران – پشدەر) نیشتەجێ دەکرێن .

**دووەمجار:** لەمانگی ٦ی ١٩٨٩ لەلایەن ڕژێمەکەی (صدام حسێن) لەگەڵ تەواوی ناوچەی پشدەر ڕادەگوێزرێ و لەئۆردوگای (بازیانی سلێمانی) نیشتەجێ دەکرێن .

**سێیەم جار:** لە ١٩٨٨/٣/٤ لەمیانەی شالآوی (ئەنفالی یەك) لەترسی ڕژێمەکەی (صدام حسێن) چۆڵ دەکرێت و خەڵکەکەی هانا بۆ ئێران دەبەن .

**مریدەکانی شێخ عبدالکریمی شەدەڵە لەگوندی کانی توو:-**

بەرەبابی کوردان بەگشتی، حاجی فەقێ — ئێستاکەش لەژیاندایەو لەشاری ڕانیە نیشتەجێیە و زۆرجار لەمزگەوتەکەی گەڕەکەکەیان کەنوێژی کردووە لەکاتی نوێژ کردندا لەپڕ ڕاچەنیوە وتویەتی: (هەقە). (ڕەسوی مینەی ئاجەرێ)، (سمایلی حەمەی ئاجەرێ)، (ئاڵڵا ڕەشی حەمەی ئاجەرێ)، (مینەی ئایشە گوڵێ)، (حەمەی ئایشەگوڵێ)، (وەسمان أحمد وەسمان)، (أحمد حمدأمین وەسمان)، (حاجی کاکەڕەش)، (عەییزی مام سەعیدی)، (حەمەی مام سەعیدی)، (شێخ مستەفا)، (پاشا)، (حەمە عەزیزە شێتە)، (سەیدەمین)، (عەولاێ سەیدی)، (صۆفی عەولا)، (مرۆت قادر)، (پور حەلیم)، (پور ئایشە گوڵێ)، (حاجی عەزیز)، (پورە خەجێ حاجی عەزیزی)

## پەیڕەوەکانی حەماغا کەبەزۆری لەگوندی کانی تووی بەری مەرگەبوون.

بریتی بوون لە: (عەزەی مینەی مەرجانێ، حەسەنی ئەحمەدی ئاجەرێ، رەسوڵی مینە شاڵی، حاجی رسول، حاجی قادر، ئەحمەدی محمودی مەلاژنێ، علی حسێنی، حەمەدەمینی فەقێ ئەحمەدی، مام عوزێر، عبدالله اسماعیل خدر، خدری شێخ ئایشێ، علی حوسێنی، پاشا، مینە شاڵی، مرۆت قادر ، عبدالله ی گۆجەی، حمدأمین ڕەسوڵ عمر، ئایشێ مام حەسەنی ، هەمینێ مینە شاڵی،) .

## ئەوانەی کە سەر بەباڵی مامەڕەزا بوون لەگوندی ( کانی توو )

(حەمەزیاد — ناسراو بە حەمەدێوانە)، (عەولاسوری حەسەنی)، (پیرۆتی حەسەنی وەستا علی)، (ئامینە حسێن)، (فاتم)، (حەلاوە سەیدەمین).

## شەڕ لەنێوان دوو لە پەیڕەوەکانی ( شێخ عبدالکریم و حەماغا )

مستەفای مینەی شاڵی گێڕایەوە و گووتی: جارێکیان شەڕ لەنێوان (مام پاشا) کەحەماغایی دەبێ و (ڕەسوە چکۆل) کەشێخ عبدالکریمی دەبێ لەکن دەرکێ مزگەوتێ لە (کانی توو) لەسەر مشتومڕی دەمارگیریان بۆ ڕێبەرەکەیان ڕوو دەدات و زۆر تێکهەڵدەدەن .

## ئەو هەقەی بۆ ژن باڵەکانی خۆی گۆڕی

(عەولا سوری حەسەنی — کە یەکەم جار مریدی شێخ عبدالکریمی شەدەڵە بووەو دوای ئەو دەبێتە حەماغایی و پاشان کەمامەڕەزا ژنێکی بۆ دەخوازێ دەبێتە مامەڕەزایی) .

## ئەو مریدانەی شێخ عبدالکریم لە ( کانی توو ) کە دەستبەرداری خۆشیی ژیانی دنیا ببوون

(شێخ مستەفا) شەوانە لەچۆڵەوانی خەوتووە، کتری و شەکرو چای بەردەوام بەکۆڵەوە بووە، هەمیشە جلوبەرگی شڕی لەبەر بووە، لە پەنجا فلس زیاتر یارمەتی لەخەڵك وەرنەگرتووە، جەستەی خۆی داغ دەکرد، ٣٢ ددانەکانی خۆی بەساغی بەگاز کێشاوە، لەحەوجۆش و ئاوی گەرمدا ئەندامی نێرینەی خۆی داغ کردووە بۆئەوەی هەوەسی بمرێنێ).

– (حەمە عەزیزە شێتە) هەموو ڕۆژێك خۆی شۆریوە .

– (پاشا) بە دوو سێ ساڵ جارێك شێت دەبوو، ملوانکە و مورووی لەبەردەکرد و بەسەربانانەدا بەغاردان دەهات و دەچووو هەر قسەیەك بەزاری داهاتبا دەری دەبڕی، بەزۆریش دەیگوت:

دایکت دەگێم ئەڵەمان

کیرت کردن بەدەرمان

قوزت کردن بەخەرمان

دیارە لێرەدا مەبەستی لەجەنگی دووەمی جیهانی بووە.

– (سەیدەمین) دەستی لەکارو کاسبی و ژن و منداڵ هەڵگرتووە، لەبەرخۆیەوە جنێوی بەمەلایەکان دەوت، (وەستا عەولاَ ئەندامی تیپی نواندنی ڕانیە) بۆی باسکردین: جارێکیان جەماعەتی نوێژی ئێوارە دەبێ لەسەربانی مزگەوتەکەی (کانی توو)، سەیدەمینیش عادەتی وابووە لەپڕ جاروبار دەیوت: دایکت دەگێم، بەڕێکەوت کە بەلای جەماعەتەکەدا تێدەپەڕێ و ئەو جنێوە دەردەبڕێ خەڵکەکەش لەوکاتەدا دەبن کەهەموویان دەڵێن (ئامین) ئیتر خەڵکەکە لەپرمەی پێکەنین دەدەن .

– (عەولاَی سەیدی) دەستی لەکارو کاسبی و ژن و منداڵ هەڵگرتووە.

– (صۆفی عەولاَ) دەستی لەکارو کاسبی و ژن و منداڵ هەڵگرتووە.

## بــــەشـــــی نـــۆیــــەم:

١- موریدەکانی شێخ عبدولکەریمی شەدەڵە لە ناوچەی پشدەر.

٢- بەشێك لە هەقەکانی ناوچەی مەرگە.

٣- بەشێك لە هەقەکانی ناوچەی بناری کوسرەت.

٤- بەشێك لە هەقەکانی گوندەکانی گەڵنێری و تۆپزاوای دووکان.

٥- ناوی دوو هەقەکانی ڕانیە.

## مریدەکانی شێخ عبدالکریمی شەدەڵە لە پشتدەر

– **لەقەڵادزێ:** (صۆفی فەتاح) کەماوەیەکیش سەرۆکی شارەوانی قەڵادزێ بووە، (صۆفی ڕەحمان) و (صۆفی حامید) ئەم سێیانە برا بوون و خەڵکی گوندی (کوێرەکانی) بوون، (پور ئایش)، (صۆفی مستەفا)، (صۆفی عەولاّ) .

– **لە نورەدین:** (صۆفی حمەد بێکڵویی)

– **لە هەنارۆك:** (صۆفی محموداغا – سەرتەکیە بووە و برای حەماغای هەنارۆك بووە )، (مینەی حەماغای (پیرۆزی هەباساغای)، (ئاغاژنە گوڵە)، (ئاغاژنە ناز)، (قالە سوتاو)، (صۆفی ئەستی قالە سوتاوی) .

– **لە وەستا سێمان:** (صۆفی عەولاّ جۆلاّی)، (صۆفی مارف) .

– **لە حەسار:** (صۆفی ئایش سەعید)، (صۆفی مەنیج حەمە مستەفا)، (صۆفی سەعید)، (صۆفی فاتم)، (محمودی صۆفی)، (ئایشە مار)، (حەمە مسەتەفا)، (صۆفی مرۆت) .

– **لەپێماڵك:** (ئەحمەدی حەمە ڕەشی – سەرتەکیە)، (صۆفی هەمزە)، (مەلا صالح)، (صۆفی حسێن)، (صۆفی مارف – بە مەلایەکانی دەوت: مەلاینە چیدیکە بوختانانم پێ مەکەن، دەنا خوا لەقیامەتێ وەك سەی پەتو دەکا )، (صۆڤ پیرۆز)، (حەمەدەمین صۆفی پیرۆز)، (ڕەسوی عەولاّی مەلاژنێ)، (سمایلی عەولاّی مەلاژنێ)، (صۆفی ئامان)، (حەمە شێت)، (صۆفی وسو)، (خلە مەنجەڵ) .

– **لە گرد مەیتەر:** (مینەی کاکەمەری – سەرتەکیە)، (حاجی سەلیماغای)، (برایمی کاکەمەری)، (صۆفی حمەدی شێخەی)، (صۆفی پەریزاد) .

– **لە سەیدەحمەدان:** (صۆفی ڕەحمان – گوایە جارێکیان لەگەڵ ژنەکەی بەسەردان دێنە گوندی حەسار کەلای ئێوارە دەبێ لە پێش چاوی خەڵك کاری سێکسی لەگەڵ ژنەکەی ئەنجام دەدات)، (صۆفی وسو) .

– **لە گردە سپیان:** (حوسێنە قوچ) .

– **لە گربداغ:** (صۆفی مریەم)، (صۆفی حمدأمین)، (ئەحمەدی صۆفی حمدأمینی) .

– **لە بێشیر:** (صۆفی مەولان)، (کەڵەوی) .

– **لە سەرتەپکان:** (مەلا لەتیف) .

– **لە کۆلارە:** (صۆفی هەباساغا – سەرتەکیە)، (صۆفی حەماغا)، (ئاغاژنە گوڵە)، (مەمەندی شێخەحمەدی) .

– **لە دێرێ:** (قالە دێرەیی – سەرتەکیە)، (مام عەلی)، (حسێن قادر)، (ئایش) .

– **لە توەرەشان:** (کاکە مەر) .

– **لە ئاشی زادە:** (محمودی صۆفی ئامینێ – سەرتەکیە)، (قالە کوێر)، (مینە خەندان)، (صۆفی برایم)، (صۆفی ئامین) .

– **لە مێرتکە:** (صۆڤ حمد)، (صۆفی برایم)، (صۆفی قادر) .

– **لە تەنگژە:** (جوامێری هەباسی)، (بابکری هەباساغای) .

– **لەهورێوە:** (صۆفی ڕەسو – کەنوێژی نەکردوون ، کە پێشیان وتووە: بۆ نوێژوو ڕۆژوو ناکەی ؟ ئەویش

وتویەتی: جا ئەگەر نوێژو ڕۆژوش نەکەم خۆ خوا ناتوانێ لەموڵکی خۆی دەرم بکات) .

– **لەهەڵشۆ:** (ئەحمەد مەزراوی) .

– **لە سەرشیو:** (حەمەی مام قادری) .

– **لە بێکڵۆ:** (صۆفی ڕەحمان)، (صۆفی عەولاّ)، (صۆفی ئاو ڕەحمان)، (حاجی سمایل)، (صۆفی شەخصە)، (صۆفی قەرەنی)، (هەمینە قوڵندە)، (گوڵە هەباس هەباساغا) .

– **لە کۆشکەڵێ:** (صۆفیاغا)، (ئاغاژنە زێڕن) .

– **لەژاراوە:** (پیرۆتی مام برایمی)، (ڕەسوڵ مەمەند)، (سمایل دارەقوڵە)، (حەمە مل قیت)، (هەمینێ حەمە مل قیتی)، (ئامینێ صۆفی پیرۆتی) .

## بەشێك لەهەقەكانی ناوچەی (مەرگە) :

**لەناحیەی بنگرد:** (کوێخا سمایلی بنگردی، عەولاّ پەڕۆ – کە وەسیەتی کردووە دوای مردنی نیوەی مەڕەکانی پێشکەش بەخانەقای (شەدەڵە) بکرێ کەدوای خۆی کوڕەکانی وەسیەتەکەی بەئەنجام دەگەیەنن ، حاجی محمد عەولاّ پەڕۆ، صۆفی پیرە).

**لەگوندی مەرگە:** (صۆفی رسول، حەسەناغا، پور پیرۆز، بەکرە شێت).

**لە چنارنە:** (مەلا ئەحمەدی حەمەی حەوێزی) و (حاجی مسەتەفا).

**لە مەلا سەفی:** (حەمەکوردە – سەرتەکیە، مام سمایل، حاجی علی حاجی پیرۆتی، حەمە گەورە، حاجی مەلا أحمد، عەولاّ سور، حاجی عزیز، مام برایم ، فاتە کۆیی، کوێخاژنە زێڕن، پور بەگی، پور هەمین، مستەفای حاجی پیرۆتی )

**لە مەمەنداوە:** (حاجی ڕەسوە قوڵە – سەرتەکیە، عزیز بۆگدە، صۆفی صالح، صۆفی سەعید، مینەی علی)

**لە قەرەتەپە:** (مەلا محمد – سەرتەکیە، علی ئامە، پورە حەبێ، عومەری مینە دەروێشی، عزیزی مەنیجێ، حسێنەدرێژ، ئایشێ مینە دەروێشی – نوێژو ڕۆژووی نەدەکرد، حەپسە، قالە شۆقە – ماڵ و منداڵی بۆ نوێژی بەیانی خەبەر دەکردەوەو بۆخۆیشی نوێژی نەدەکرد، ئەحمەدی پور حاسمەی، پیرۆتی حەمەی خاڵدی، سمە شەل، قالە شێت، مەمەندی پوورزای، مەمەندی مستەفای، مەمەندە جوغە، حەمە بزوت، حەمەی پور خەیاڵێ، عەولاّی سێوێ، ماماغا، صۆفی وەسمان)

**لە سەرسیان:** (پور فاتم – کە هەر بزنێکی هەبووەو بەخشیویەتی بەشەدەڵە)

**لە سێوکان:** (حەمە تەنکە، حسێن سێوکانی، ئایشە شێت، قادر سێوکانی، ئامان، مەمەندی پەستەڕەشی) .

**لە بێموشە:** (برایمی حەمەی قادری – سەرتەکیە، پیرۆتی مام برایمی، مریەم قوربانی)

**لە بەردەکۆز:** (ئەحمەدە شێت / سەرتەکیە)، (عەولاّی سمایلە شەلی)، حەمەی مینە دەروێشی) .

**لە دێلێژە:** (عەبۆل / سەرتەکیە)، (فاتە قیت)، (علی سمێڵ قیت)، (حابیشان) .

**لە خۆشاو:** (باپیراغا)، (حاجی محمد)،(مامەمین)، (کاك ئاوڕەحمان – موختاری گوند)، (حەوێزی حەمیدی –

سەرتەکیە)، (حەنیف مستەفا)، (حەبیب مستەفا حمد)، (سەعە قەرانگویٚ)، (عبدالله و ڕەحمان حاجی سەعید)، (عبدالله و ڕحمان حاجی عزیز)، (ئەحمەدی حاجی محمدی)، (نادری سافەی)، (ئایش)، (حاجی سەعید)، (حسێن چەلەنگ)، (صالحی پیرۆتی حەمە خاڵەی) .

**لە کوێرەکانی**: (قادرە سور – سەرتەکیە)، ٠(محمود حەمە شەریف)، (صالح حەمە شەریف)، (ئەحمەد حەمە شەریف)، (عەولاٚ حەمە شەریف)، (پور ئامان)، (خاڵە گدرون حسێن)، (خانزاد)، (حەبە مستەفا)، (صدیق و سەعید و حسن و حاجی و سەلیم مەجید حاجی صالح)، (فەتاح و عەولاٚی مەلای)، (حسن و حەمەی حسنی عەولاٚی)، (عەولاٚی حەسەنی عەولاٚی)، (ڕسوی هۆمەری)، (سمایل و عەولاٚیٚ وەیسی)، (وەسمانی خدر شاشی)، (مریەمی خدری ئیسای) .

**لە هەنجیرە**: (حەمە عزیزی کوێخا عەولاٚی – سەرتەکیە، مەلا محمد أمین، حەمەی بابەسێنی، ئەحمەد حمدأمین أحمد، ئامان حمدأمین أحمد، مستەفا پیرۆت ئیسماعیل، فاتم حمدأمین أحمد– لەدایکبووی ١٩٢٥ کە لەمریدەکانی شێخ عبدالکریم لەهەنجیرە هەر ئەو لەژیاندا ماوە وتی: دایك و باوکم ببونە مریدو ئەمنیش کەعازەب ببوم دەمگوت: دەبمە مرید. ئەوانیش پێیان دەگوتم: باری تۆبە گرانە و بەتۆ هەڵناگیریٚ، پاشان وتیان: کە (ڕێژەو) کرایەوە، واتە (تەریقەت پێدان) کرایەوە. ئەوەبوو لەگەڵ دایك و باوکم چوومە (شەدەڵە) و لەخزمەت شێخ عبدالکریم کە ئەوکات نەخۆش بوو لەسەر جێگا تەریقەتم وەرگرت، دواتر کە شوم کرد لەبەرئەوەی مێردەکەم هەقە نەبوو نەمدەتوانی سەردانی (شەدەڵە) بکەم ، (سمە زیتە) – کە لەسەرچاوەی تریش ئاماژەی بۆکراوە (پور فاتم) لەبارەیەوە دەیوت: ژنەکانی دێیەکە بەسوعبەت پێیان دەگوت: (مام سمایل ماچت نادەینیٚ)، ئەویش عادەتی وابوو دەبوایە پێەوانەی ئەو شتە بکات و دەیگوت:(توخوا ماچم بدەنیٚ)، ژنەکانیش کەڕوویان بۆلای دەبرد کەماچیان بکات (مام سمایل دەیگوت (رۆرەم) واتە (ڕۆڵەم) نابیٚ، هەروەها (مام سمایل) کەهێلکەی لەگوندەکە کۆدەکردنەوە بۆ خانەقای شەدەڵە گەر یەکێك پێی گوتبایە (مام سمایل نەچی ئەو هێلکانە بشکێنی) (مام سمایل)یش یەکسەر هێلەکەکانی دەدا بەعەرزدا، یان کەپێی دەگوترا: (مام سمایل نەچی پانتۆڵەکەت دانێی) ئەو پێچەوانەکەی دەکردوو پانتۆڵەکەی دادەنا.

(أحمد کوێخا عەولاٚ، ڕیحان، محمود دیلان، پیرۆز، بابەسێن، ئەستی، مریەم، ئایشیٚ مستەفای)کەوا (مەلا حمدامین) مەلای گوندەکە لەمزگەوتەکە یان لەشوێنی جێخونی خەرمانی کن ماڵەکان قسەیبۆ هەقەکان دەکرد زۆرجاریش هەقەکانی (کوێرەکان) و (خۆشاو)یش لەبەر نەبوونی شوێن دەهاتنە (هەنجیرە) .

**لە پەڵکۆ**: (حاجی عبدالله عزیز)، (حەمە گەروە پیرۆت)، (حاجی شێخ سمایل)، (مام جەلال)، (قادر حەمەد)، (پیرۆز عبدالقادر)، (ئلیشە مستەفا حسن)، (مام عەولاٚ قادر)، (بەڵقیس)، (حەمەشکاك)، (پور ئایش)، (حسێن محمد پیرۆت) .

**لە پاشکێش**: (حەمە شێخەی عەولاٚی بابیلی)، (ئەحمەدی پیرۆتی شێخەی – سەرتەکیە) – کە ئەم دوانە بەهەردووکیان مانگایەکیان هەبووە پێشکەش بەشەدەڵەیان کردووە، وێڕای ئەوەش کە ١٠ سەر خێزانیش بوون، (شێخە عبدالله شێخە)، (حەمە صدیق أحمد پیرۆت)، (حاصمی صالح بابکر)، (صالح شێخە عبدالله)، (خەیاڵ

عبدالله)، (مستەفا شێخە عبدالله)، (پیرۆز وەسمان)، (عبدالرحمن شێخە)، (نەخشین حەمە سەعید) .

**لە یاخیان**: (حاجی سمایلی گردە ڕەشی – کە هەر گاجوتێکی هەبووە پێشکەش بەشەدەڵەی کردووە)، (عبدالرحمن فەقێ محمد – جوانەگایەکی پێشکەش بەشەدەڵ کردووە)، (مامەمین) .

**لە خوڕخوڕە**: (صۆفی سەعید)، (صۆفی پیرۆت) .

**لە شارستێن**: (حاجی تەها)،(حمدأمین ئیسماعیل) .

**بەشێك لەهەقەکانی بناری کۆسرەت:-**

ئەم زانیاریەمان لە بەڕێز (کاك قادر چاوشین) لەدایکبووی ۱۹۵۰ ئالیقەی سەروو پێگەیشت .

**لە ئالیقەی سەروو**: (حەمەی مام حسێنی – سەرتەکیە، رسول پیرۆت، ئەحمەد ولیا، سەعیدی رسو بەگی، حەبوبکر قادر)

**لە کانیە سپان**: (نادرو مستەفا و محمد ی کوێخا سەمەد) .

**لە شوشکە**: (مەلا قادر – سەرتەکیە، برایمی مام ڕەسوی، ئەحمەدی خدری) .

**لە هەنجیرە**: (کوێخا حەمەدی پیرۆتی – سەرتەکیە، مام برایم، مام ڕەشید، کانەبی)

**لە شیواشان**: (مام عارف سەعدولاّ)

**لە چناران**: (مام مارفە قوتە، مام سابیر) .

**لە تۆربە**: زۆربەیان مامەڕەزایی بوون و لەماڵی (مام خاڵدە) کۆ دەبوونەوە .

**بەشێك لەهەقەکانی لە ( گەڵنێری و تۆبزاوا )**

(سمایلە ڕەش – سەرتەکیە، شێخ مەلا ئەحمەد، کاکەحەمەی شێخ مەلا ئەحمەد، فەقێ عبدالله، عزیز مارف، عەولاّ سور، عارف جەبار، مینەڕەش، پیرۆتە ڕەش، سمە گەردەش – ئەحە جوندی کوڕی بۆی باسکردین گوایە کە (شێخ عبدالکریمی شەدەڵە) کۆچی دوایی دەکات باوکی ۱۷ جوچکە مریشك قوت دەدات لەتاوانی، مامەقالە، صۆفی رسوڵی قادری رسوی، مینە شین، نالەشێت، خولەی خدری، حەمەدەمین حەمەد، علی مستەفای، مەولود ئیسماعیل، قادر قادر، صۆفی رسول حمد، پیرۆت حمد، صۆفی حمد أحمدە سور، زوبێد عەبدول حەمەسور، حەلیمە محمدأمین، صۆفی ڕابی، کەتان سمایل، خەجێ هۆمەر، خەجێ کاکەحەمە، خاتو ئایشە، فاتم ئەحمەد محمد، ڕەسوڵی مریەمێ) .

**لە تۆبزاوا**: (حمەدأمین ڕکاوایی – سەرتەکیە، کوێخا لەتیف، عومەر مستەفا، ڕەشکەڵە)

## ناوی دوو هەقەکان لە ڕانیە

(عبدالرحمن گەڵنێری)، (پور ئایش).

## بـــەشـــی دەیـــەم:

١- زنجیرەی شێخایەتی تەریقەتی نەقشبەندی.

٢- زنجیرەی بەرەبابی بنەماڵەی شێخ عەبدولکەریمی شەدەڵە.

٣- زنجیرەی بەرەبابی بنەماڵەی حەمەسوور.

٤- زنجیرەی بەرەبابی بنەماڵەی حەماغای پشدەر.

# زنجیرەی شێخایەتی تەریقەتی نەقشبەندی - بزووتنەوەی هەقە




# زنجیرەی بەرەبابی بنەماڵەی شێخ عبدالکریمی شەدەڵە



# زنجیرەی بەرەباب و بنەماڵەی حەمەسور

- صۆفی علی
  - صۆفی بابكر
    - أحمدە سور
      - حەمەسوری هەڤە
        - عبدالله
        - فاتمە
          - یاسین
          - ڕزگار
          - بەختیار
    - علی
      - بابەكر
        - حەمە صالح
        - علی
          - خەدیجە
          - عبدالله
          - هەمین
          - خاتون
        - عبدالله
        - رسول
          - عزیز
          - ئایشە
          - فاتمە
          - ئامین
          - بەكر
          - عبدالله
          - عوسمان
          - علی
          - عمر
        - أحمد
          - محمود
          - كەریم
          - مریەم
          - پیرۆز
          - د. محمد شەشۆیی
          - گوڵە
          - عمر
          - صالح
          - ئەختەر
          - صمد
          - عوسمان
          - خەدیجە
      - شەریف
      - محمد
        - ئامینە
      - هەمین
    - قادر
      - پیرۆز
      - حاجی حسن / كركوك
        - رسول
        - محمد
      - ئایشە
    - محمود
      - صۆفی وەستا سەعید
        - محمد
          - عارف
          - مارف
          - عبدالرحمن
          - عبدالرحیم
          - جەمال
          - كەمال
          - مینا
          - شەریف
          - ئامینە
          - ئەزیرە
          - پەریزاد
        - محمود
          - عبدالله
          - صالح
          - پەریزاد
          - أحمد
          - عوسمان
          - ئامینە
          - محمد
        - قادر
          - تۆفیق
          - كەریم
          - فاتیمە
          - ئەبوبكر
          - كامەران
        - هەمزە
          - رەحمە
          - جەلال
          - جەمال
          - جەبار
        - فاتیمە
        - ڕەمەزان
        - محی الدین
      - صۆفی هەمزە

سەرنج/ سوپاس و پێزانی بۆ بەڕێز كاك ( جەبار هەمزە وەستا سەعید كەتەم زنجیرەی بەرەبابەكەیانی بۆ ئامادەكردین

## زنجیرەی بەرەباب و بنەماڵەی ( حەماغای پشدەر )



## سەرچاوەکان:

ئەو سەرچاوانەی کە بۆ ئەم پەڕتوکە (بزووتنەوەی هەقە) وێڕای بەدواداچونەکانی خۆمان لە ژمارە (٥٠)ی گۆڤاری (شمشارە) ساڵی (٢٠٠٩) بەکارمان هێناون و سودمان لێ وەرگرتوون بریتین لە:

١- ئاوڕدانەوەیەك لەبزووتنەوەی هەقە (مستەفاعەسکەری).

٢- بۆ لەهەقە کەوتنە تەقە؟ ڕەئوف محمد زوهدی.

٣- ڕەوشی ئایینی و نەتەوەیی لەکوردستان، د. ڕەشاد میران.

٤- صۆفیگەری، د . ئیبراهیم ئەحمەد شوان.

٥- (تەصەووف چیە ؟، شێخ ئەمین شێخ عەلائەدین نەقشبەندی)

٦- ڕاپەڕینی عەلەویەکانی زاگرۆس، محمد علی سولتانی، وەرگێڕانی (حسن عبدالکریم، کەمال ڕەشید) .

٧- (ئاینستان، کەریم زەند).

٨- چێشتی مجێور، هەژار موکریانی).

٩- ڕۆژنامەی (هەواڵ) ژمارە ٣٥٣ تشرینی دووەمی ٢٠٠٩، بابەتی (بزووتنەوەی هەقەو حەمەسوری کەلاوقوت - عەدنان ئیبراهیم زەردکی).

١٠- گۆڤاری (کاروان) ژمارە ١٥ کانونی یەکەمی ١٩٨٣ بابەتی (مەسەلەیەکی مەزن و هەوڵێکی کەم - ڕەشید محمد علی).

١١- (کوردستانی نوێ) ژمارە ١٩٨٨ بەروار ١٩٩٩/١٠/٣١، بابەتی (حەمەسوری کلاوقوت یەکێ لەڕابەرایەرانی بزووتنەوەی هەقە - فریاد شوانی).

١٢- (ئالای کورد، هاوڕێ باخەوان).


حەمەسوری کلاوقوت


مەلیح فتح الله کلاوقوتی


بەختیار / یەکێ لەنەوەکانی حەمەسور


شێخ عبدالکریمی شەدەڵە


حەمەسوری کلاوقوت


ئامان برایم جوبلاغی


شەریفی رەسوی ئەستیێ


ئەبوبکر کلاوقوتی


بەڕێز ( جەبار هەمزە وەستا سەعید )



حاجی حسن شێخاوەدەلان



ئەحە جوندی گەڵنێری



ئامان برایم



فاتیمە / کچەکەی حەمەسور



م. عباس عبدالرزاق اکبر



حاجی حمدی صۆفی ئایشێ



خاتو ئایشێ گەڵنێری



عبدالله صۆفیاغا



سمایلاغای ئالاٚوێ



مستەفا مینە شالی



حەمەسوری کلاّوقوت



حەمەسوری کلاّوقوت



حەمەسوری کلاّوقوت



حەسەن کەریم صۆفی شەریف / زاواکەی حەمەسور



حەسەن جوبلاّغی



حەمەسوری کلاّوقوت



شێخ هاوڕێ کاکە حەمە مامەڕەزا



مامەڕەزا



شێخ محمود کاکە حەمە شێخ عبدالکریم



**تاتەحەلاو قەرانگوی/ دواکەسی باڵی حەمەسوری کە لەژیاندا ماوە**

الدولة العراقية
وزارة الشؤون الاجتماعية
مديرية النفوس العامة

دفتر نفوس
صادر بموجب القانون رقم ٥٩ لسنة ١٩٥٥
للذكور

الرقم ٠٠٦١٥٦ اللواء: كركوك

تسجيل النفوس العام لسنة ١٩٥٧

صاحب الدفتر رقم ( ٠٠٦١٥٦ )

الاسم واللقب ........
اسم الاب والجد ........
اسم الام والجد ........

اسم رئيس الدائرة ........
التوقيع ........
التاريخ ........

-١-

**عنوان القيد**

رقم سجل النفوس العام ........
الصحيفة ........
اللواء ........
القضاء ........
الناحية ........
رقم المسكن ........
المحلة او القرية ........

**الأوصاف الجسمية والشخصية**

العلامات الفارقة الثابتة ........
العاهات الجسمية الظاهرة ........
الدين ........
المهنة أو الحرفة ........
الحالة العلمية ........

-٢-

رقم الدفتر ( ٠٠٦١٥٦ ) كركوك

**محل الولادة**

(داخل العراق)
رقم المسكن والشارع ........
نوع المسكن ........
المحلة أو القرية ........
الناحية ........
القضاء ........
اللواء ........
(خارج العراق) يذكر اسم المدينة التي ولد فيها والدولة ........

**تاريخ الولادة**

(رقما) اليوم الشهر السنة
كتابة ........

**سند التاريخ المذكور**

-٣-

**الحالة الزوجية**

هل صاحب الدفتر :
أعزب ........
متزوج وعدد الزوجات ( ........ )
اسم الزوج الكامل ........
أرمل ........
عدد الاولاد عند منح الدفتر ذكور اناث

-٦-

**دەفتەر نفوس = پێناسەکەی حەمەسور**